# کوردۆلۆجی

پرۆفیسۆری یاریدەدەر سەلام ناوخۆش

م. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو    د.ئیدریس عەبدوڵڵا

چاپی شەشەم    2010





* ناوی کتێب: کوردۆلۆجی

* نووسینی: کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ

* تایپێست و نەخشەسازی: کۆچەر ئەنوەر

* بەرگ: ئەبوبەکری مەلا عەبدوڵڵا

* چاپ: شەشەم 2010

* چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر

* تیراژ: 3000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(2269)ی ساڵی 2009ی پێدراوە.

# ناوەڕۆك

## پێشەکی

لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری 1991 و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان بابەتێکی ڕۆشنبیری لە قۆناغی یەکەمی زانکۆ داندرا بەناوی "کوردۆلۆجی" . دانانی ئەو بابەتە زۆر لەجێی خۆی بوو، بەڵام ئەفسوس دوای هەژدە ساڵ لە پەیڕەوکردنی ئەو سیستەمە، کوردۆلۆجی بە ئاقارێك

دابردرا نەك هەر پەیامی خۆی لەدەست دا، بەڵكو بووە بابەتێكی بێ بەرنامەو (پەراوێزخراو) لە نێوەندی زانكۆدا.

لەبەر ڕۆشنایی هەست كردن بە بەرپرسیاریەتی مێژوویی و نەتەوەیی لە ئاست ئەم قەیرانە، ئێمە وەك چەند مامۆستایەكی زانكۆ و نووسەر بەپێویستمان زانی ئاوڕێك لەم بابەتە بدەینەوەو سەنگێكی زانستی بۆ ئەم بابەتە دابنێین.

لە دانانی ئەم كتێبە (كوردۆلۆجی)، ئێمە دوو ئامانجی سەرەكیمان هەیە. یەكەم كوردۆلۆجی وەك وانەیەك گرنگی پێبدرێ، چونكە هەبوونی ئەم بابەتە نەك هەر لە كۆلێژە مرۆڤایەتییەكان، بەڵكو لە كۆلێژە زانستییەكانیش زۆر گرنگە بۆ نەوەی نوێ كە ئاگاداری كەلتووری نەتەوەیی خۆی بێ.

دووەمیش، وەك ناوەندێكی ڕۆشنبیری. بابەتی كوردۆلۆجی بابەتێكە زۆر گفتوگۆ و گەنگەشەكردن هەڵدەگرێ شارەزابوونی قوتابیانی زانكۆ بەو كایە رۆشنبیرییە كەناڵێكی چالاك دەبێ بۆ رۆشبیری گشتی و ڕۆشنبیری نەتەوەیی ساخلەم. گومانی تێدا نییە كە زمان زانین و هەبوونی زانیاری دەربارەی زمان، بەتایبەتی زمانی نەتەوە، هۆكارێكن بۆ بونیادنانی زانستی هەر تاكێكی كۆمەڵگا.

بابەتەكانی كوردۆلۆجی بەشێوەیەكی ئەكادیمی ڕێكخراون. سەرەتا بە گرنگمان زانی بەكورتی لەچەمكی كوردۆلۆجی بدوێین ، هەروەها ئاماژە بەو كوردناسانەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بكەین كە لە كتێبەكانیاندا بە (چاك) و (خراپ) باسی كوردیان كردووە، هەروەها بەشێك تەرخانكراوە بۆ جوگرافیای كوردستان ، ئەم بابەتە رۆشنبیرییە كاریگەرییەكی باشی دەبێ لەسەر ئاستی زانیاری قوتابیانی زانكۆ، چونكە بەڕاستی نەنگییە قوتابی زانكۆ، لەهەر كۆلێژێك بێ، هیچ دەربارەی سروشت و جوگرافیای نیشتمانەكەی نەزانێت.





بەشی دووەم تەرخانكراوە بۆ زمان بەگشتی و زمانی كوردی بەتایبەتی ، هەروەها هەر لەم بەشەدا قسە لەسەر هەردوو ئەلفبێی (كوردی) و (لاتینی) كراوە ، هەردووك بەراوردیش كراون.

بەشی سێیەم تایبەتە بە ئەدەب و ئەدەبناسی و ئەدەبی كوردی و ڕەوانبێژی.

پ. ی. سەلام ناوخۆش    د. ئیدریس عەبدوڵڵا    م. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو

## دەروازە

## چەمکی کوردۆلۆجی

کوردۆلـۆجی یـاخود کوردناسـی لـە مێـژووی ئـەدەب و کـەلتور زمـانی کـوردی دەکۆلێتـەوە ، کوردناسـەکان بـەر لـە کـورد لـە کوردیـان کۆڵیوتـەوە، ئـەو هـەموو توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە و ڕاپۆرتانـەی ڕۆژئاواییـەکان لەسـەر کوردیـان نووسـیوە، بەشتێکی گرنگ لە کەلەپور و کەلتوری کورد پێکدەهێنن.

ئەو بوارە زانستییەی مرۆڤناسی (کـورد) ، خـۆی لەبنەڕەتـدا کـارێکی مەیـدانی پـیرۆزە ، بـەڵام زۆر جـار هـەتا خـودی ئـەو کوردناسـانە ئـەو پیرۆزییـە دەبـەزێنن و وێنایـەکی ڕاسـت و دروسـتی کۆمـەڵگای کـوردی ناکـەن ، ئـەم سـنور بەزاندنـەش زۆ بواری گرنگـی ژیـان و مێـژووی کـوردی گرتۆتـەوە، ئەمـەش شـتێکی چـاوەڕێکراوە ، چونکە هەموو ئەوانەی وەك گەریدە و زانا و مرۆڤناس هاتوونەتە کوردستان ، پیـاوی زانست و ڕاست نەبوون، بـەڵکو زۆربـەیان پیـاوی حکومـەت و جاسـوس بوونـە ! لـەم ڕوانگەوە گرنگە کـورد بـە عەقلیـەتێکی ڕەخنـەیی ئـەو مێـژووی خـۆی بخوێنێتـەوەو جارێکی تر خۆی بینووستێتەوە، هەروەها لەم ڕوانگەوە دەمانەوێت ڕۆناکبیری کـورد خۆی ئەو مێژووەی خۆی بـە گـوێرەی بنـەماکانی میتۆلـۆژی زانسـتی بنووسـێتەوە ، تاکو مێژووەکەی و کەلتوورەکەی هاوشانی چەمکی کوردۆلۆجی بێت.

### * مێژووی کوردۆلۆجی

بێگومـان کوردۆلـۆجی لقێکـە لـە ڕۆژهەڵاتناسـی ، بـەواتای کوردناسـی لـە هـەناوی ڕۆژهەڵاتناسیەوە لەدایك بووە، چونکە ئەویش وەك ڕۆژهەڵاتناسـی دیتنـی ڕۆژئاوایـە بۆ کورد ! د.عەبدوڵڵا جەودەت یەکەم کەس بووە ، کـە وشـەی کوردناسـی لـە سـاڵی 1913 بەکارهێناوە ، جەلادەت بەدرخانیش لە ساڵی 1934 لە وتارێکی بە نـاوی ( کورد و کوردستان ب جاڤی بیانیان ) بەکاری هێناوە، لـە سـییەکانەوە کوردناسـی و ڕۆژهەڵاتناسی لەناو ئەدەبیاتی کوردیدا بەرچاو دەکەون.

کوردناسەکان زۆربەی لەو ڕەگەزان بوون:





1 ـ عـەرەب 2− فـارس 3− ئەرمـەنی 4ــ ئـەلمانی 5ــ ئیتـالی 6ــ ڕووسـی 7ـ فەرەنسی 8 − بەریتانی .

لەو وڵاتانە چەند دەزگایەکی ئەکادیمی هەن، کە بەسەدان ئەرشـیفی دیکـۆمینتی کوردی تێدایە ، کە زادەی عەقلی ئەو کوردناسـانەیە، هـەروەها کـەلتوری کوردییـە و کورد پێویستی پێیەتی.

### * کوردناسە موسلمانەکان:

لـەدوای ئاشـنابوونی کـورد بـە ئـایینی ئیـسلام ، کـورد وەك نەتەوەیـەك بەشـێك لەنووسـراوەکانی مێـژوونووس و جوگرافینـاس و سەربردەنووسـانی موسـلمانانی داگیرکردووە ، ئەو نووسینانە لەزۆر ڕووەوە جێگەی متمانـەن ، چـونکە ئەوسـا هـیچ ململانێیەکی نەتەوەیی و ئایینی و مەزهـەبی لـەئارادا نـەبووە، هـەروەها ئەوسـا ئـەو هەموو نەتەوانەی ئەمڕۆ هەموو بەشدار بوون لە دەسەڵات و بونیادنانی شارسـتانیەت و مەدەنیەتی ئیسلامیدا. لەخوارەوە ئاماژە بەهەندێ لەو نووسـەرانە و کتێبـەکانیان دەکەین:

1 ـ محەمەدی کوڕی جەزیری تەبەری (839 ـ 923 ز)

کتێبە مێژوویەکەی بە (تاریخ الامم والملـوك ) ناسـراوە، ئـەم کتێبـە لـە دروسـتبوونی بوونەوەرەوە دەست پێدەکات هـەتا سـاڵی 915ی زایینـی ، لـە زۆر شـوێن باسـی کوردی کردووە.

2 ـ ئیبن ئەسـیری جـەزیری / ئـەبی حەسـەنی عـەلی کـوڕی محەمـەدی شـەیبانی لـە 630ی کۆچی مردووە .کتێبەکەی بـە(الکامـل فـی التـاریخ )ناسـراوە، ئـەم کتێبـە بەدرێژەپێدەری کتێبەکەی تەبەری دێت و سـەبارەت بـە کـوردەوە بـە درێـژی باسـی بزووتنەوە کوردییەکانی سەدەی نۆیەم و دەیەم دەکات.

3 ـ حـافز عیمـادەدین ئـەبو فیـدای ئیـسماعیلی کـوڕی کەسـیر ،ناسـراوە بـە ئـیبن کەسیری دیمەشـقی ، لـە 774ی کۆچـی مـردووە، کتێبەکـەی بـە( البدایـة و النهایـة) ناسراوە

4 ـ دینەوەری ساڵی 895ی زایینی مردووە، کتێبەکەی ناوی (الاخبار الطول).

5 ـ ئەلیەعقوبی ساڵی 897ی زایینی کۆچی مردووە،کتێبەکەی ناوی(مێژووی ئەلیەعقوبی)یە .

6 ـ ئیبن ئەلسەمکەرییە ،ساڵی 1030ی زایینی کۆچی مردووە، کتێبەکەی بە (تجارب الامم)ناسراوە.

7 ـ ئیبن حزەدازبە ساڵی 913ی زایینی کۆچی مردووە، کتێبەکەی ناوی( المسالك والممالك).

8 ـ ئیبن الفقیە ساڵی 902ی زایینی کۆچی مردووە، کتێبەکەی ناوی( کتاب البلدان )ە.

9 ـ ئەستەخری ساڵی 951ی زایینی کۆچی مردووە، کتێبەکەی( المسالك والممالك).

10ـ ئیبن حەوقەل ساڵی 977ی زایینی کۆچی دوایی کردووە ،کتێبەکەی ناوی (صورة الارض)ە.ئیبن حەوقەل لەم کتێبەی زۆر بەرووونی نەخشەی کوردستانی کێشاوە ، هەردوو بەشی ((جیبال))و((جەزیرەی))ی دیاریکردووە.

11ـ ئەلمەقدیسی ساڵی 985ی زایینی کۆچی دوایی کردووە، کتێبەکەی ناوی ( أحسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم).مەقدیسی زۆر بەدرێژی باسی لە داب و نەریت و کەلتورو وڵاتی کوردان کردووە. کوردستانی بەهەرێمی سەربەخۆ لە وڵاتانی دی داناوە.

12ــ یاقوت حەمەوی (1170 – 1229) ،کتێبەکەی یاقوت زۆر ناسراوە و زانیاریەکی زۆری لەبارەی کوردەوە تێدایە، کتێبەکەی ناوی (مجمع البلدان)ە..

ئەمە هەر لەسەدەی سێیەمی کۆچیەوە موسلمانە گەڕۆك و وڵاتناسەکان نەك هەر باسی کورد و کەلتوری کورد و ئاایینی کوردیان کردووە ،بەڵکو زۆربەی جوگرافیناسەکان نەخشەی کوردستانیان کێشاوە.

**کوردناسە ڕۆژئاواییەکان**

هەرچەندە زەینەفۆن یەکەم ڕۆژئاواییە، کە دوای هێرۆ دۆتسی مێژوونووس، شتی لەبارەی کوردەوە گوتبێت ،هەروەها لەسەردەمی شەڕی خاچ پەرستەکانیش





پەیوەندی لەنێوان ڕۆژئاوا و کورد دروست بووە، ئەمەش لەلایەك بە هۆی سەلاحەدین ئەیوبیەوە بووە، لەلایەکی تریش زۆربەی سەربازەکانی سوپای سەلاحەدین کورد بوون.

ئەم جۆرە پەیوەندییانە زۆر پەیوەست نین بە بواری کوردناسییەوە . زانستی ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی لەسەر ئەو بنەمایە دانەڕێژراون ،بەڵکو ئەوجۆرە پەیوەندی و ناسینە لە ئاکامی شەڕەوە دروست بوون.

بەحوکمی ئەوەی جولەکە و ئەرمەنی پەیوەندیەکی کۆنیان لەگەڵ کوردان هەبووە ، بۆیە ئەوان بەر لەخەڵکانی دی ڕۆژئاوایی باسی کوردیان کردووە. لەم بەشەش هەوڵ دەدەین ئاماژە بەناوی هەندێ کوردناس و نووسراوەکانیان بکەین:

**1ـ مارکۆ پۆلۆ 1254 ـ 1324**

جوگرافیناس و گەڕالێکی ناسراوی ئیتالییە،ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێ کە مارکۆ پۆلۆ یەکەم ڕۆژئاواییە ناوی (کوردستان)ی بەکارهێناوە.

**2 ـ ژان باپتیست تاڤێرنیە (1605 ـ 1689)**

بازرگانێکی فەرەنسی بووە، لەساڵی 1632ی زایینی گەشتێکی بۆ کوردستان کردووە ، کتێبەکەی بەناوی (شەش گەشت لەتورکیاوە بۆ پاریس )ە. گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە گەشتەکەی تاڤێرنیە بۆ کوردستانی هاوکات بووە بە بەردەوامی سەفەرنامەکەی (ئەولیا چەلەبی) و سەردەمی ئەحمەدی خانی شاعیر.

**3 ـ کریسستین نبوور**

یەکێ لەو گەڕیدانەیە کە گەشتی بۆ کوردستان کردووە، ئەو گەشتەی لەساڵی 1766 چاپ کردووە و باسێکی لەسەر کورد نووسیوە.

**4ـ مێریلا گالیتی**

کتێبێکی لەسەر کوردان نووسیوە بەناوی (کەلتوری کوردی لە نووسراوەکانی ئیتالیەکاندا) .

**5 ـ قەشە مۆریزیۆ گارزۆنی**

لەساڵی 1787 کتێبێکی بەناوی (ڕێزمانی دانە وشەی زمانی کوردی) بڵاو کردۆتەوە.

**6 ـ لێرخ**

یەکێ لەو کوردناسە ڕووسانە بووە ، کە زۆر شتی لەسەر کورد نووسیوە ، سێ کتێبی لەسەر کوردەکانی ڕۆژهەڵات نووسیوە.

**7 ـ ئەلێکسەندەر ژابا (1803 – 1894 )**

ئەلێکسەندەر ژابا زۆر لەگەڵ مەلا مەحمودی بایەزیدی (1799 – 186 )دۆست بووە بەهاوکاری ئەو چەندەها دەستنووسی کوردیان لەفەوتان رزگار کردووە. هەندێ توێژەر نووسینەکانی بایەزیدی و ژاپا بە سەرەتای سەرهەڵدانی پەخشانی کوردی دادەنێن .

**8 ـ ئەلبێرت سۆسین**

توێژەرێکی ئەلمانییە پرۆفیسۆر بووە لەبواری زمانەوانیدا. نووسینەکەی لەبارەی کوردانەوە بەناوی ((لێکۆلینەوەیەکی فیلۆلۆجی زمانی کوردی ))یە ، ساڵی 1898 لە ستراسپۆرگ بڵاوی کردۆتەوە.

**9 ـ باسێل نێکتین 1885 – 1960**

باسێل نیکتین بەهاوکاری مەلا سەعیدی شەمدینانی 1885 – 1918 زۆر نووسینی لەبارەی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە، ناسراوترین کتێبی باسیل نیکیتین کتێبی ((کورد لێکولینەوەیەکی سۆسیۆلۆژی و مێژوویی))یە .

**10 ـ مینۆرسکی 1877 – 1966**

ڤلادمێر مینۆرسکی یەکێ لەو کوردناسانەیە ، کە نووسینێکی زۆری لەبارەی زمان و ڕەسەن و کەلتووری کوردەوە نووسیوە ،هەر ئەو بوو وتی : کورد نەوەی میدیەکانن.





**11ـ کرێس کۆچێرا**

یەکێ لەو کوردناسانەیە کە هێشتا لە ژیانداماوە ،ـ چەندان جار هاتۆتە کوردستان ، کتێبی (بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردو هیوای سەربەخۆیی )یەکێ لە کتێبە دانسقەکانیەتی.

بێگومان سەدان کوردناسی تر هەن، کە بەباشی و خراپ زۆریان لەسەر کورد نووسیوە، وەك مێجەرسۆن یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە کوردستان دەرکردووە. ئەدمۆنز فەرهەنگی (کوردی– ئینگلیزی) لەگەڵ تۆفیق وەهبی نووسیوە ، مێجەر نوئێل هاوکاری شێخ مەحمودی کردووە لەحوکمداری یەکەمی شێخدا.

هەندێك لەو کتێبانەی لەبارەی کوردو کوردستان نووسراون:

1– دەیڤد ئادەمسۆن ، شەڕی کورد ، لەندەن ، 1964 .

2– فریدریك باریس ،بنەماکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی لەباشووری کوردستاندا،ئۆسلۆ،1953 .

3– بێنیگسۆن، کوردەکان و کوردۆلۆجی لەیەکێتی سۆڤیەت، پاریس، 196 .

4–جۆیس بلۆ، فەرهەنگی کوردی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی ، پاریس، 1965 .

5–دێرك کینان، کوردەکان و کوردستان . لەندەن، 1964 .

6–سوزان میسیلەس ، کوردستان لە سێبەری مێژوودا نیویۆرك 1997 .

7–پیتەر سلوگلێت ،بەریتانیا لە عێراقدا 1914 – 1932 ، لەندەن ، 1976 .

# بەشی یەکەم
# جوگرافیای کوردستان

## سنوورەکانی کوردستان

کوردستان بە هەموو پارچەکانییەوە، واتە: کوردستانی گەورە وڵاتێکی ئاسیاییە، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئەو کێشوەرە، سنوورەکەی لە باکوورەوە لەگەڵ ئازەربێجان و ئەرمێنیاو تورکیا دایە، لە باشوورەوە لەگەڵ ئێران و کەنداوی (عەرەبی ـ فارسی) هاوسنوورینە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ئێران و لە ڕۆژئاواشەوە عێراق و سوریا دەوری دەدەن، ئەم ناوچانەش کە کەوتوونە نێوان ئەو وڵاتانەوە، هەر لە کۆنەوە وڵاتی کوردان بوونە.

بە واتا: کورد بە یەکێك لەو میللەتانە دەژمێردرێت، کە هەر لە چاخە کۆنەکانەوە پێکهاتەی دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتیان پێکهێناوە.

## ناوی وڵاتی کوردان

هەموو ئەو وڵاتەی کوردی تیا ژیاوە، لە کۆندا لە ڕووی سیاسییەوە ناوی (کوردستان) نەبووە، بەڵکو ناوانی دیکەی بەسەردا براوە، ئەوەتا بۆ نمونە: تا چەرخەکانی پێنجەم و شەشەمی کۆچی، یانزەو دوانزەی زاینی، وڵاتی کورد بەسەر چەند هەرێمێك دابەشبووە، لەو مێژووەی ئاماژەی بۆ کرا وڵاتی کوردان بەسەر ئەم هەرێمانەی خوارەوە دابەش بووە:

1ـ هەرێمی چیاکان (ئەقلیمی جیبال)

2– هەرێمی غەربی ئیقلیمی جیبال

3ـ هەرێمی جەزیرەی فوراتی





4ـ هەرێمی ئازەربێجان

5ـ هەرێمی ئەرمێنیا

6ـ هەرێمی لوڕ (لوڕستان)

7ـ هەرێمی شەهرەزوور (شارەزوور)

8– هەرێمی ڕاز

جگە لەمانەش هەندێ هۆز و تیرەو کۆمەڵەی کوردی تر هەبوون، لە هەرێم و شوێنەکانی دیکەی وەکو: (وڵاتی فارس و خوزستان و وڵاتی شام)دا دەژیان.

لێرەدا ڕەنگە پرسیاری ئەوە درووستبێت، کە: ئایا (ئازەربێجان) و (ئەرمێنیا) لە کۆندا هەرێمی کوردی بوونە؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین کوردستانە، مەرج نییە لە کۆندا کوردستان هەر ئەوەندە بووبێت، بەڵکو وەکو ئاماژەمان پێدا زۆر هەرێمی دیکەش هەبووە لە کۆندا کوردی تیا ژیاوە، وەکو ئاماژەمان بۆ کرد (ئەرمێنیا) و (ئازەربێجان)یش ڕۆژگارێك بووە، کە ئەوە هێندە دوور نییەو چەرخەکانی پێنجەم و شەشەمی کۆچی، یانزەو دوانزەی زاینی شاهیدن، کە ئەوسا کورد نەك هەر دانیشتوانی ئەو هەرێمانەی بووە، بەڵکو فەرمانڕەوایەتیشی تێدا کردوون، بەڵام کە ئێستا کورد لەو هەرێمانە نەماون، یان بوونەتە کەمینەیەکی زۆر کەم، ئەوە بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە، ئەوانیش یەکیان پەیوەندی بە کورد و ژیانی کۆنی میللەتانی ڕۆژهەڵان هەبووە، ئەوەی دووەمیش پەیوەندی بە دوژمنانی کوردەوە هەبووە.

ئەوەی پەیوەندی بە کوردەوە هەیە، ئەوەیە کە: لە کۆندا بژێوی میللەتان بە گشتی و میللەتانی ڕۆژهەڵاتیش بە تایبەتی لەسەر مەڕداری بووە، ئەوەش ناچاری کردوون، کە هەمیشە بە دوای لەوەڕی باشتردا بگەڕێن، لە هەر جێیەك تووشی وشکە

ساڵی و قات و قڕی هاتبێ ئاسایی بۆ شوێنێکی دیکەیان گوازتۆتەوە، لەوەشدا چ گرفتێکیان نەدیوە، مادام بەوە ژیانی باشتر و سەقامگیرتریان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە.

ئەوەی پەیوەندی بە دوژمنانی کوردیشەوە هەیە، هەر لە کۆنەوە ئەوانەی بە شەڕوشۆڕ هاتوونە هەرێمە کوردییەکانیان و داگیریان کردوون، خەڵکی خۆیان لە هەرێمەکاندا نیشتەجێکردووە، بەوەش وڵات لە کورد تەسك بۆتەوە، شوێنەکەیان جێهێشتووە، بۆ شوێنێکی تر ڕۆشتوون، هەروەك چۆن کاتی خۆی سەلجوقییەکان کە هاتنە ئەرمێنیاو ئازەربێجان (غەز)ە تورکەکانیان لەو وڵاتانەدا نیشتەجێکرد، بەوەش بەشێکی کوردانی ئەوێ وڵاتەکەیان لێ تەسك بووەوە، بەرەو هەرێمەکانی دی هاتن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا هەر کورد زۆر بوون لەو وڵاتانە، تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیش ڕێژەی کورد تیایان، هەر زۆر بوو، تەنانەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 کوردیش وەکو هەر نەتەوەیەکی دیکەی چوارچێوەی شورەوی (دەوڵەتی سۆفیەت)ی نوێ حکومەتێکیان بە ناوی (کۆماری کوردستانی سوور) دامەزراند، بەڵام ئەو حکومەتە تەمەنی زۆر نەبوو، دوای هاتنە سەر تەختی (ستالین)، ئەو کۆمارە ڕووخێنرا، کوردەکانی ئەوێ بەسەر نۆ وڵات و شەست و چوار شاری چوارچێوەی (سۆفیەت)ی گەورە دابەشکران، بەوەش گەورەترین زەبر بە کورد و وڵاتەکەی لەو ناوچانەدا کەوت، ئێستاکە کورد وەکو کەمینەیەکی کەم لەوێدا دەبینرێن.

**یەکەم بەکارهێنانی زاراوەی (کوردستان)**

تا ئەو ماوەیەی پێشوو لە لای مێژوونووساندا وا باو بوو، کە یەکەم کەس زاراوەی (کوردستان)ی بڕیبێتە سەر وڵاتی کوردان، مێژوونووس و شارناسی فارسی (حەمدوڵڵای مستەوفی قەزوینی) مردوو لە (750 هیجری/ 1349ز) بووە، ئەوەش





لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی (نزهە القلوب) ، بەڵام دواتر لێکۆڵەران زانیاری نوێیان دیتەوە، بە پێی ئەو زانیاریە نوێیانە دەرکەوت، کە: (قەزوینی) یەکەم کەس نییە زاراوەی (کوردستان)ی بڕیبێتە سەر وڵاتی کوردان، بەڵکو ئەو زاراوەیەی (کوردستان) لە نووسراوەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی هیجری/ سێنزەی زاینی چەندین جار هاتووە، هەندێ لە مێژوونووس و گەڕیدەکان لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە بۆ وڵاتی کوردان دەیان ساڵ بە پێش (قەزوینی) کەوتوونە.. ئەوەتا بۆ نمونە:

1ـ گەڕیدەی ئیتاڵی (مارکۆ پۆلۆ) کە لە (723هیجری/ 1323زاینی) مردووە، ساڵی (670 هیجری/ 1270زاینی) دەستی کردووە بە گەشتێك بۆ هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و لە نێویشیان وڵاتی کوردان، لە گەشتنامەکەیدا زاراوەی (کوردستان)ی بۆ وڵاتی کوردان بەکارهێناوە.

2ـ مێژوونووسی مەغۆلی (ڕەشیدەدین فەزلوڵڵای هەمەدانی) مردوو لە (718هیجری/ 1318زاینی) لە کتێبەکەی خۆیدا (تأریخ المغول) زیاتر لە جارێك وشەی (کوردستان)ی بەکارهێناوە.

**هۆکارەکانی درەنگ بەکارهێنانی زاراوەی (کوردستان)**

بێگومان زیاتر لە هۆکارێك هەبووە بۆ ئەمە، لەوانە گرنگترینیان لەم خاڵانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

1ـ ڕەنگبێت یەك لە هۆیەکان ئەوە بووبێت، کە وڵاتی کوردان هەر لە کۆندا لە ڕووی سیاسییەوە زۆر سەقامگیر نەبووە، بۆیە بەردەوام چەندین دەسەڵاتی ناوچەیی هۆزو خێڵە گەورەکان بەڕێوەی بردووە، ئەوانە وڵاتی کوردانیان بۆ چەند هەرێمێك بە گوێرەی بڵاوبوونەوەی خۆیان بەسەر خۆیاندا دابەشکردووە، لەبەر ئەوەش هەر هەرێمێکی بە ناوی هۆزێك، یان ناوچەیەك ناونراوە.

2ـ زاراوەی (کوردستان) خۆی زاراوەیەکی نوێیە بە بەراورد لەگەڵ مێژووی کۆنی وڵاتی کوردان، کە پێکهاتەکەی ئەو زاراوەیە پەیوەندی بە زمانی نوێی کوردو زمانە نوێیەکانی نەتەوەکانی دەوروبەرییەوەی هەیە، کە بێگومان ئەو زمانەی سەدەکانی دوانزەو سێنزەی زاین کورد قسەی پێکردووە، ئەو زمانە نەبووە، کە لە هەزارەکانی یەکەم و دووەمی پێش زاین باب و باپیرانی کورد قسەیان پێکردووە، وەك چۆن ئەو زمانەی ئێستا کورد قسەی پێدەکات ئەو زمانە نییە کە نزیکتر لەوە، تەنیا سەد ساڵ پێش ئێستا کورد قسەی پێکردووە، ئەوەش لەبەر خۆنوێکردنەوەی زمان، بە هەمیشە وەرگرتنی وشەی نوێ و لە دەستدانی گەلێ وشەی کۆن، کە بە تێپەڕینی مێژوو بوونیان نامێنێ، بۆیە بێگومان خۆشیان نامێنن، مەگەر لە فەرهەنگەکان ببیاندۆزینەوە.

3ـ خەڵکی خۆجێیی ناوی لە وڵاتی خۆی نەناوە، ئەو بە شارەکەی خۆم، یان گوندەکەی خۆمان، یان ئاواییەکەمان و...هتد ئاماژەی بۆ ئەو شوێنە کردووە کە تیایدا ژیاوە، واتە ئەو هەستە نەتەوەییە نەبووە، زاراوەیەکی سیاسی نەتەوەیی بسەپێنێت.

## تۆپۆگرافیای (کوردستان)

زەوی و زاری کوردستان لە ڕووی بەرزی و نزمییەوە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە لەیەکجیاوازە، هەندێ شوێنی تەخت و دەشتی پان و بەرینی کاکی بە کاکین، هەندێ شوێنی دیکەیشی بەرزن، کە بە شێوەیەکی گشتی جوگرافیناسان دەڵێن: ناوچەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە چیای بەرز داپۆشراون، بەرزایی هەندێکیان زیاترە لە چوار هەزار مەتر لە ئاستی ڕووی دەریا، لە نێو ئەو چیایانەش هەندێ دەشتایی تەخت هەن، بەڵام ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوا نزمن و





چیایان کەمە، بە زۆری لە دەشتایی پێکهاتوون و گردیش لێرەو لەوێ بە دیار دەکەون.

بۆیە بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: تۆپۆگرافیای کوردستان لە سێ بەشی جوگرافی جیاواز پێکهاتووە، ئەوانیش بریتینە لە: (چیاکان) و (گردەکان) و (دەشتاییەکان).. لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێ لایەنی گرنگی هەریەکە لەم سێیانە:

### یەکەم: چیاکانی کوردستان

ـ نیوەی زیاتری تۆپۆگرافیای کوردستان لە چیا پێکهاتووە، کە ئەم چایانە خۆیان لە چەند زنجیرەیەکدا دەبیننەوە، ڕووی ئەو زنجیرە چیایانە بە زۆری لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتن.. بەرزاییان لە پێنجسەد مەترەوە دەست پێدەکات و وردە وردە لەگەڵ درێژبوونەوەیان بەرزیش دەبنەوە، تا دەگەنە پێنج هەزار مەتر، ئەو بەرزییەش هێندە زۆرە، بە شێوەیەك کە لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا کەم هەیە ناوچەیەکی دیکەی بێجگەی کوردستان، چیاکانی بگەنە ئەو بەرزییە.

ــ لوتکەی چیاکان زۆر بڵند و قەدەکانیان زۆر ڕك و پێچاوپێچن، لە هەندێ شوێنیشدا زۆر لە یەکتر نزیك دەبنەوە، بەمە لە گەلێ شوێندا دۆڵی سەختیان درووستکردووە، قووڵایی هەندێکیان دەگاتە سەدان مەتر.

ـ ژمارەی چیاکانی کوردستان تا ئێستا بە تەواوەتی دیار نییە، سەرچاوەکان لەمڕووەوە ژمارەی لەیەك جیا دەڵێن، هەیانە دەڵێت: 122 چیا لە کوردستان هەیە، هەشیانە ئەو ژمارەیە بەرزدەکاتەوەو، دەڵێت: ژمارەی چیاکانی کوردستان بریتییە لە 220 چیا.

## گرنگترین چیا و زنجیرە چیاکانی کوردستان

لە کوردستاندا چیا و زنجیرە چیاکان یەکجار زۆرن ، لێرەدا تیش دەخەینە سەر هەندێ لە گرنگترینیان، کە بریتین لە:

ـ گرنگترین زنجیرە چیاکانی کوردستان، زنجیرە چیای (زاگرۆس)ە، هەرێمی ئەو چیایە گەلێ پان و بەرینە، هەر لە باکووریەوەی چیاکانی باشووری دەریاچەی (ورمێ)نە، تا دەگاتە باشووری تەنگەبەری (هورمز)، درێژیەکەی 1400کم، پانیەکەشی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا لە نێوان 100 تا 300 کیلۆمەتر پانە. ڕووبەری ئەم زنجیرە چیایە 332000کم چوارگۆشەیە.. لەبەر فراوانیی دابەشکراوەتە سەر (زاگرۆسی باکوور) و (زاگرۆسی باشوور) و (زاگرۆسی ناوەند).

## گرنگی چیاکانی کوردستان

چیاکان لە گەلێ ڕووەوە جێی سوود و بایەخن، لەوانە گرنگترینیان:

1ـ لە ڕووی سیاسی و عەسکەرییەوە بوونەتە شورەیەکی قایم بە ڕووی دوژمنان، هەر لە کۆنداو بە تایبەت لەو سەدەیەی ڕابردوو پەناگەیەك بوونە بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد.

2ـ گەلێ کانزای گرنگ و جۆراوجۆر لە خۆیان هەڵدەگرن.

3ـ بەردەکانیان بۆ جوانکاری و بنیاتنانی خانووبەرەو پڕۆژەی جۆراو جۆر لە بواری بیناسازی سوودی گەورە دەگەینن.

4ـ قەدپاڵەکانیان دارستانی گەورەن و گەلێ جۆر داری گرنگیان لێ دەڕووێت.

5ـ دەبنە بەربەستی باش بەڕووی بای بەهێز، بەوەش زەوییە کشتوکاڵییەکانی نزیکیان دەپارێزن.





6ـ هۆکاری باشی گەشتوگوزارن و لەم ڕووەوە دەرامەتێکی باش بۆ خەڵکی دانیشتووی خۆیان زامن دەکەن.

### دووەم: گردەکانی کوردستان

گردەکانی کوردستان بە زۆری لە چەند زنجیرەیەکی خواروخێچی چەماوە پێکهاتوون، لە چاو چیاکانی دەوروبەریان زۆر بەرز نین، بەڵام لە چاو دەشتەکانیش ئەوان بە تەواوی جیانەو دەبینرێت، کە چەند بەرزن، هی وایان هەیە، لە هەندێ شوێنیدا بەرزاییەکەی دەگاتە 1750 مەتر، وەکو ئەمە لە بەشی ڕۆژهەڵاتی گردی (پاسینلەر)ی کوردستانی باکوور دەکەوێتە بەرچاو، هەشیانە لەوەش بەرزترن، وەکو هەندێ بەشی گردی (گەوەر) کە بەرزاییەکەی دەگاتە 2000مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاو، هەندێ بەشی گردی (کواندە)ش بەرزاییەکەی دەگاتە 2430مەتر لە ئاستی ڕووی دەریا.

### سوودی گردەکان

ئەو گردانە لە چەند ڕووێکەوە سوود بە دانشتووانی دەوروبەری خۆیان دەگەینن، لەوانە:

1ـ هەندێجار دەبنە بەربەستێك بە ڕووی هێرشی بای بەهێز و ناوچە دەشتاییەکانی دەوروبەریان لە هەندێ لەو زیانانە دەپارێزن، کە لەوانەیە بایە بەهێزەکان دووچاریان بکەن.

2ـ لە ڕووی مەڕدارییەوە ئەو گردانە هەمیشەو بە تایبەت لە بەهاراندا دەبنە لەوەڕگای گرنگ بۆ مێگەلەکان.

3ـ هەندێ لەو گردانەی کە زۆر بەرزو سەخت نین و پشتێکی تا ڕادەیەك پانیان هەیە، بۆ بەرهەمهێنانی دانەوێڵە (گەنم و جۆ) سوودیان لێوەردەگیرێت.

## گرنگترین گردەکانی کوردستان

ئەو گردانە زۆرن، زۆربەشیان دەکەونە هەرێمی کوردستانی عێراق، لەوانە:

1ـ بایەزید: دەکەوێتە سێگۆشەی کوردستان و ئێران و تورکیا.

2ـ بەرزنجە: دەکەوێتە سنووری پارێزگای سلێمانی، لە نێوان زنجیرە چیاکانی هەورامان و دەشتی پانی شارەزوور، شاربازێڕیش دەکەوێتە بەشی باکووری.

3ـ کەرکوک: لە نزیك ڕووباری دیالە دەست پێدەکات، بەرەو ڕۆژئاوا درێژدەبێتەوە تا دەگاتە دەشتی هەولێر.

4ـ باسینلەر: دەکەوێتە ناوچەی (ئەرزرۆم) لە کوردستانی باکوور.

5ـ کواندە: دەکەوێتە باکووری شاری دهۆك.

## سێیەم: دەشتەکانی کوردستان

دەشتەکانی کوردستانیش بەشێکی دیکەی گرنگی خاکی کوردستان پێکدەهێنن، ئەو دەشتانە پان و بەرین و تەختن، ڕووبەرەکانیان لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت، بەڵام بە هەموویان 15٪ی ڕووبەری گشتی خاکی کوردستان دادەپۆشن.

## سوودی دەشتەکان

سوودی دەشتەکانی کوردستان گەلێ زۆرن، لەوانە:

1ـ لە ڕووی ئابوورییەوە بڕبڕەی پشتی ئابوری کوردستان پێکدێنن، چونکە لە ڕووی کشتوکاڵییەوە زەوییەکانیان زۆر بە پیتە، دەتوانن دانەوێڵەی تەواوی نەوەك تەنها کوردستان بەڵکو ناوچەکانی دەوروبەری کوردستانیش پێك بێنن، ئەوەتا تەنیا بەشێك لە دەشتەکانی کوردستانی عێراق، دەتوانن بەروبوومی دانەوێڵەی هەموو عێراق زامن بکەن، بۆیە پێیان دەگووترێت: (سله الخبز العراقی).

لە لایێکی دیکەوە دیارە جگە لە کشتوکاڵ، (نەوت)یش لە زۆربەی ناوچە دەشتاییەکانی کەرکوك و هەندێ ناوچەی هەولێر و شوێنانی دیشدا هەیە، کە ئەوەش گرنگییەکی یەکجار گەورەی هەیە.





2ـ شوێنی حەوانەوەی خەڵکێکی زۆرن و زۆرێکی شارو شارۆچکەو گوندەکان بەخۆوە دەگرن.

## هەندێ لە دەشتە گرنگەکانی کوردستان

هەندێ لە گرنگترین دەشتەکانی کوردستان بریتینە لەمانەی خوارەوە:

1ـ دەشتەکانی (حەویجە، ڕانیە، شەنگار، سلێمانی، سندی، شارەزوور، قەراج، کەندێناوە، هەولێر) لە کوردستانی عێراق.

2ـ دەشتەکانی (شوی، مەریوان، ...) لە کوردستانی ئێران.

3ـ دەشتەکانی (ماردین، ئورفە، ..) لە کوردستانی تورکیا.

## ئاو و هەوای (کوردستان)

### 1ـ پلەی گەرمی

پلەی گەرمی کوردستان لە نێوان هەوایەکی بیابانی گەرم و هەوای ساردی دەریای ناوەڕاستدایە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی جیاوازی هەیە، چونکە ئەو هۆکارانەی کار لەسەر ئاووهەوای ناوچەکان دەکەن، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە لە یەك جیاوازە، ئەوەتا تا بەرەو باکووری کوردستان بچین پلەی گەرمی ڕوو لە نزمبوونەوە دەبێت، بە پێچەوانەوە تا بەرەو باشوور بێینەوە پلەی گەرمی ڕوو لە بەرزبوونەوە دەبێت.

جیاوازی پلەی گەرمی لە ناوچەکانی باکوور و باشووری کوردستان جیاوازییەکی زۆرە، بۆ نمونە لە وەرزی زستاندا پلەی گەرما لە شارەکانی باکووری کوردستان زۆر ڕوو لە نزمبوونەوەیە، زۆر بۆ ژێر سفر دادەبەزێت، ئەوەتا پلەی گەرمی لە دەڤەری شاری (قەرەکوسە)ی کوردستانی باکوور لە زستاندا بۆ (30 یان 35 پلە) بۆ ژێر سفر دادەبەزێت، لە ناوچەکانی باشووری کوردستانیش لە هاویندا پلەی گەرمی بە

ڕێژەیەکی گەورە بەرزدەبێتەوە لە کرمانشان دەگاتی نێوان (35 و 45 پلە)، لە خانەقین دەگاتە نێوان (40و45 پلە)، لە هەولێر و کەرکوکیش دەگاتە نێوان (40و 45و50 پلە).. بەوەش جیاوازی پلەی گەرمی نێوان ناوچەکانی کوردستان لە دوورترین خاڵی باکوور لە زستان و دوورترین خاڵی باشوور لە هاویندا دەگاتە نێوان (80 یان 85 پلە) کە ئەوەش جیاوازییەکی وەکو ئاماژەمان پێدا گەورەیە.

## چۆنیەتی دەستنیشانکردنی جیاوازی پلەی گەرمی وڵات

دیارە دەستنیشانکردنی جیاوازییەکانی نێوان پلەی گەرمی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە بەوە دەبێت، کە لە زستاندا دوورترین خاڵی باکوور و لە هاویندا دوورترین خاڵی باشوور وەربگرین، پاش ئەوە دەردەکەوێت کە جیاوازی پلەی گەرمی وڵاتەکە چەندە، نەك لە هاویندا یان لە زستاندا پلەی گەرمی دوورترین خاڵی باکوور و باشوور وەربگیرێت.

## 2ـ بارانی کوردستان

هەرچی بارانیشە لە ناوچە شاخاوییەکاندا تا بەرەو باکوور بەرزبینەوە زیاتر دەبارێت و بەفری ئەستورتر دەکەوێت، کە لە هەندێ ناوچەدا ئەو بەفرانە تا وەرزی هاوینیش دەمێننەوە، بەڵام لە ناوچە دەشتاییەکانی باشوورو ڕۆژئاوا، تا بەرەو خواروو بێینەوە باران کەم دەبێتەوە، بەفریش زۆر بە کەمی دەنا نابارێت، ئەگەریش باری ئەوا بە زوویی دەتوێتەوەو زۆر خۆی ناگرێت.

لای زانایانی بواری ئاوو هەوا ڕادەی باران بارین لە کوردستاندا بەو شێوەیە دەستنیشان دەکرێت: لە ناوچە شاخاوییەکاندا ڕادەی ناوەندی باران بارین لە ساڵێکدا لە نێوان 700 تا 300 ملیمەترە، بەڵام ڕادەی ناوەندی باران بارین لە





ناوچە دەشتاییەکانی باشوورو ڕۆژئاوا لە ساڵێکدا لە نێوان 200 تا 400 ملیمەتر دایە.

## ئەو هۆکارانەی کار لە ئاوو هەوا دەکەن

ژمارەیەك هۆکار کار لە ئاوو هەوا دەکەن، لەوانە گرنگترینیان:

## 1ـ دەریاکان

کوردستان ئەگەرچی ڕاستەوخۆ نەکەوێتە سەر یەك لە دەریا گەورەکان، بەڵام بە چەندین دەریای گەورەی وەکو: (خەزەر و ڕەش و سوور و ناوەڕاست و ئەسکەندەرۆنەو کەنداوی عەرەبی) دەورە دەدرێت، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئاوو هەوای ئەوان، بە تایبەتیش ئاوو هەوای دەریای ناوەڕاست و کەنداوی عەرەبی، ئەوەتا زۆر جار لە زستاندا شەپۆڵی سارد و بەفر و باران کە لە ناوچەکانی دەریای ناوەڕاستدا هەڵدەکات لە خاڵە سنوورییەکانی باکووری کوردستانەوە دێتە نێو کوردستان و بەرەو ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری کوردستان درێژدەبێتەوە، بە پێچەوانەوەش زۆرجار لە هاویندا گەردەلول و بای بەهێزو گەرم کە لە ناوچەکانی کەنداوی عەرەبییەوە سەرچاوە دەگرن لە خاڵە سنوورییەکانی باشووری کوردستانەوە بەرەو ناوچەکانی ناوەڕاست و باکووری کوردستان درێژدەبێتەوە، بەوەش لە هەردوو باردا پلەی گەرمی کوردستان بەرز، یان نزم دەبێتەوە.

## 2ـ وشکایی

ئەو دەوروبەرەی سەرجەم پارچەکانی کوردستانی گەورە بەخۆوە دەگرێت، دەوروبەرێکی وشکاییە، واتە: لە هەموو لایێکەوە کوردستان ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی

وشکاییەوە بە وڵاتانی دەوروبەری بەستراوەتەوە، بەوەش کەرتێکی گەورەی وشکایی لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا درووست دەبێت، کە ئەو کەرتەی وشکایی ئاسیا بە گەورەترین کەرتی وشکایی سەر ڕووی زەوی دادەنرێت، بۆیە ئاوو هەوای ناوچە وشکاییەکانی دەوروبەری کوردستان هەرچییەك بن، کاریگەری دەکەنە سەر ناوچەکانی کوردستان و گۆڕان بەسەر ڕادەی باران بارین و بەرزی و نزمی پلەی گەرمییەوەی دادێنن.

**3ـ بەرزی و نزمی لە ئاستی ڕووی دەریا**

تا لە ئاستی ڕووی دەریا ناوچەکان بەرزتر بن پلەی گەرمییان نزم دەبێتەوە، بە پێچەوانەوەش ناوچەکان تا لە ئاستی ڕووی دەریاوە نزم ببنەوە، پلەی گەرمییان بەرز دەبێتەوە، بۆیە لە کوردستاندا هەرچەندە لە ناوچە شاخاوییەکاندا بەرەو باکوور بەرزبینەوە، پلەی گەرمی نزمدەبێتەوەو ڕادەی بەفر و باران بارینیان زۆرو گەورە دەبێت، بە پێچەوانەوەش تا بەرەو دەشتاییەکانی باشوور و ڕۆژئاوای کوردستان بێینەوە، چونکە لە ئاستی ڕووی دەریاوە نزمدەبینەوە، بۆیە پلەی گەرمی بەرزدەبێتەوەو بەفر و بارانیش کەم دەکەن.

**سامانی ئاوی (کوردستان)**

سامانی ئاوی هەر وڵاتێك لە سێ سەرچاوەی سەرەکییەوە بۆی درووست دەبن، ئەوانیش بریتینە لە:

1ـ ئاوی سەر زەوی

2ـ ئاوی ژێر زەوی

3ـ ئاوی باران و بەفر

کوردستان ئەگەرچی نەکەوتبێتە سەر یەك لە دەریا، یان ئۆقیانۆسە گەورەکان، کە لە ڕێی ئەوانەوە دەروازەیەکی نوێ و گرنگی بۆ مسۆگەر بێت، بۆ پەیوەندیکردن





بە وڵاتانی دنیا، بەڵام لە ناوەخۆدا سەرچاوەی ئاوی زۆری هەیە، ئەو ئاوەی لە چەندین ڕووبارو دەریاچەوە خۆی دەنوێنێت، بۆیە وەکو جوگرافیناسان لێیانکۆڵیوەتەوە: کوردستان بۆ خۆی لە ئاودا دەوڵەمەندە، تەنانەت بە سەرچاوەیەکی گەورەو گرنگی ئاوی وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژئاوای ئاسیاش دەژمێردرێت.. چونکە سەرەنجام ڕووبار و زێیەکانی کوردستان دەڕژێنە دەریا گەورەکانی وەکو: کەنداوی عەرەبی و ئەسکەندەرۆنە و زەریای خەزەر و ڕەش و دەریاچەکانی وان و ورمێ و ئەوانی ترەوە..

لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر گرنگترین ئەو ڕووبار و دەریاچانەی کوردستان.

**یەکەم: ڕووبارەکانی (کوردستان)**

لە خاکی کوردستاندا چوار ڕووباری گەورە سەرچاوە دەگرن، هەر یەکەیان بە سەدان کیلۆمەتر بە ناو خاکی کوردستاندا تێدەپەڕن، سەرەنجام سنوری کوردستانیش دەبڕن، دەپەڕنەوە وڵات و هەرێمەکانی دەوروبەر، ئەو ڕووبارانە بریتینە لە:

1ـ ڕووباری (ئاراز) یان (ئاراس)

لە ناوچەی (بینگۆل) سەرچاوە دەگرێت، 435 کیلۆمەتر بە کوردستاندا دەڕوات، سنووری نێوان ئێران و تورکیا و شورەوی جاران دەبڕێت، دەڕژێتە دەریای (قەزوین)ەوە، سەرجەم درێژییەکەی بریتییە لە 920 کیلۆمەتر.

2ـ ڕووباری (دیجلە)

لە ناوەڕاستی (تورۆس) لە باکووری شاری (دیاربەکر)ەوە لە (دەریاچەی گوولچووك)ەوە سەرچاوە دەگرێت، سەرجەم درێژیەکەی 1900 کیلۆمەترە، لەو درێژییەیدا نزیکەی 847 کیلۆمەتر بە خاکی کوردستاندا تێدەپەڕێت، ئیتر بە

زەوییەکانی عێراقدا بەرەو خوار تێدەپەڕێت، تا لە نزیك شاری (بەسرا) لەگەڵ (ڕووباری (فوڕات) تێکەڵ بە یەك دەبنەوەو (شەتولعەرەب) پێکدەهێنن.

3- ڕووباری (فوڕات)

زێی (قەرەسوو) لە باکووری ئەرزرۆم سەرچاوە دەگرێت، 460 کیلۆمەتر درێژدەبێتەوە، زێی (مورأد)یش لە چیای (ئالاداغ)ەوە لە ناوچەی نێوان دەریاچەی (وان) و (ئاگریَ)وە هەڵدەقووڵێت، ئەویش 615 کیلۆمەتر درێژدەبێتەوە، دوای ئەوە هەردوو ئەو زێیانە ئاوەکانیان تێکەڵ بەیەك دەکەنەوە، بەم یەکگرتنەیان ڕووباری (فوڕات) پێکدەهێت.

درێژی ڕووباری فوڕات لە سەرچاوەکەیەوە تا دەگاتە ئەو شوێنەی لەگەڵ ڕووباری دیجلە یەکدەگرێتەوەو ئیتر (شەتولعەرەب) پێکدەهێنن، 2800 کیلۆمەترە، لەو درێژییەیدا 2170 کیلۆمەتر بە خاکی کوردستاندا تێدەپەڕێت، لەبەر ئەوەشە بە درێژترین ڕووباری کوردستان دادەنرێت.

4- ڕووباری (قزل ئۆزۆن)

ئەم ڕووبارە لە ڕۆژئاوای شاری (دیواندەرە)ی کوردستانی ڕۆژهەڵات (ئێران) سەرچاوە دەگرێت، بە باشووری شاری (ڕەشت)دا تێدەپەڕێت، کە لەوێدا بە ناوی (سفیدرِوود) دەناسرێت، سەرەنجام دەڕژێتە دەریای (قەزوین)ەوە.

**چەند زانیارییەك لە بارەی ڕووبارەکانەوە**

1ـ کوردستان خاوەنی چەندین ڕووبارە، هەندێکیان لە ڕووی درێژی و بڕی ئاویانەوە دەشێن لەگەڵ ڕووبارە گرنگەکانی دنیا بەراوردیان بکەین، بەڵام هەندێ ڕووباری دیکەشمان هەن لەبەر کورتییان لەسەر نەخشەدا دیاری نەکراون و ئاماژەیەکی ئەوتۆیان بۆ نەکراوە.





2ـ زانیاری ڕوون لەسەر ڕووبارەکانی کوردستان نییە، ئەوەی لەسەریشیان نووسراوە، زۆری ئاڵۆزەو سوودێکی وەها ناگەیەنێت.

3- ڕووبار هەر یەك ناوی هەیە، بەڵام ئەوەی لە کوردستاندا دەبینرێت، لە هەر ناوچەیەکدا ڕووباەکان بە ناوێك دەناسرێن، ئەوەش پەیوەندی بەو خەڵکە لێکجیایانەوە هەیە، کە بە درێژایی ئاوەڕۆی ڕووبارەکە لێرەو لەوێیدا دەژین و هەر یەکەی لە ناوچەکەی خۆی ناوێکی ناوچەیی لیَ دەنێت.

4- ڕووبارەکان لە سەرچاوەکانیانەوە زۆر بە تیژی سەرچاوە دەگرن، بە هەمان هێزیشەوە دەڕژێنە دەریای لە خۆیان گەورەترەوە.

5ـ ئەو ڕووبارانەی سەرچاوەکانیان لە بەفر و کانییەکان هەڵدەگرن، ئاویان هەمیشە نابڕێت، بەڵام ئەو ڕووبارانەی سەرچاوەکانیان ئاوی بارانە بە نەمانی باران ئەوانیش ئاویان کەم دەکات و، بچوکدەبنەوە.

6- ڕووبارەکانی کوردستان لەبەر قوڵی و تیژڕۆیشتنیان بۆ هاتووچۆی دەریایی دەست نادەن و لەمرووەوە سوودیان لیَ وەرناگیرێت.

7- ڕووبارەکان سەرچاوەی گەلیَ سامانی ئاوی گرنگن، بە تایبەت سامانی ماسی.

**دووەم: زێیەکانی (کوردستان)**

زێ لە ڕووبار بچوکترە، کوردستان چەند زێیەکی گرنگ بەخۆوە دەگرێت، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

1- زێی گەورە.. لقی هەرە گەورەی ڕووباری دیجلەیە، لە کوردستانی باکوورەوە سەرچاوە دەگرێت و بەرەو کوردستانی باشوور درێژدەبێتەوە، تا دەگاتە ئاوبەندی بێخمە، لەوێشدا بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوات، تا لە باشووری شاری موسڵ دەڕژێتەوە نێو ڕووباری دیجلە.

ئەو درێژبوونەوەیەی بەو هەرێمانەی کوردستاندا 450 کیلۆمەتر ە، سەرەنجام دەڕژێتەوە رووباری دیجلە.

2ـ زێی بچوك: لە ئاوەکانی دەشتی لاهیجانی ڕۆژئاوای شاری مهاباد پێکدێت.. بە پێی هەندێ سەرچاوە، زێی بچووك 400 کیلۆمەتر درێژەو بە درێژترین لقی رووباری دیجلە دادەنرێت.. لە سنووری قەڵادزێوە دەپەڕێتەوە کوردستانی عێراق و دەڕژێـە ئاوبەندی دوکان، لەوێشەوە بەرەو پردێ دێت و سەرەنجام لەگەڵ زێی گەورەدا دەڕژێتەوە رووباری دیجلە.

3ـ زێیەکانی بەتلیس و بۆتان لە کوردستانی باکوور.

4ـ زێی سیروان کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو کوردستانی باشوور درێژدەبێتەوە.

**سێیەم: دەریاچەکانی (کوردستان)**

کوردستان چەندین دەریاچەی گرنگ بەخۆوە دەگرێت، لەوانە گرنگترینیان:

1ـ دەریاچەی وان.. دەکەوێتە کوردستانی باکوور.. رووبەرەکەی 3765 کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، تێکڕای قوڵاییەکەی 100 مەترەو، 1120 مەتر لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزە.. ئاوی ئەو دەیایە زۆر سوێرە لەبەر ئەوە هیچ زیندەوەرێکی دەریایی تێدا ناژیت.

2ـ دەریاچەی ورمێ.. دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری ورمێ لە کوردستانی ڕۆژهەڵات.. رووبەری گشتیی 6000کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، تێکڕای قوڵاییەکەی 6 مەترەو لە هەندێ شوێندا دەگاتە 15 مەتر.

3ـ دەریاچەی خەزەر، یان (دەریاچەی گوولچووك).. دەکەوێتە باکووری شاری دیاربەکر لە نزیك سەرچاوەی دیجلەو، 1155 مەتر لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزە.





4ـ دەریاچەی زرێوار لە سنووری شاری سنە.. رووبەری گشتیی 77 کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، تێکڕای قوڵاییەکەی 15 مەترە.

دیارە جگە لەمانەش دەیان زێ و جۆگە ئاوی دیکە بە هەر هەموو پارچەکانی کوردستانەوە دابەشبوونەو، بە هەموویان گرنگییەکی زۆرتر بۆ کوردستان مسۆگەر دەکەن.

## پێناسەی زمان

تا ئێستا چەندین پێناسەی جیا جیا لەبارەی زمانەوە خراونەتەڕوو، بۆیە لێرەدا هەندێ لەو پێناسانە دەخەینەڕوو:

چۆمسکی دەڵێت: ((زمان کۆمەڵە ڕستەیەکە، ڕێزمان دەریان دەکات)).

بلۆك و تراگەر دەڵێن: ((زمان کۆمەڵە ڕەمزێکی دەنگی لەخۆوەیە، کە دەتوانرێت بۆ لەیەکتر گەیشتن بەکاربێت)).

ساپیر دەڵێت: ((زمان هۆیەکی ناغەریزییە و تایبەتە بە مرۆڤ، بۆ دەربڕینی هەست و ئارەزوو بەکاردێت، بەهۆی ڕەمزی لەسەر یاسا ڕۆیشتوو کاردەکات و لەژێر یاسای مرۆڤدایە)).

مارتنێت دەڵێت: ((زمان هۆیەکە بۆ لەیەکتر گەیشتن، لەچەند دانەیەکی بچووك پەیدا دەبێ، ئەو دانانەش خاوەنی واتای خۆیانن)).

کارۆڵ دەڵێت: ((زمان کۆمەڵە ڕەمزێکی دەنگی لەخۆوەیە، کە دەتوانرێ بەکاربێت بۆ گەیشتن و پۆلکردنی شت و ڕووداوەکانی دەوروبەر)).

کەواتە لە ڕوانگەی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی بڵێین زمان: ((گرنگترین ئامێری پەیوەندی و لەیەکترگەیشتنی ئادەمیزادە)).

### ئەرکەکانی زمان

زمان زۆر واتا لەخۆ دەگرێت ، نە کۆمەڵگا بەبێ زمان دەبێ ، نەهیچ شارستانیەتێکیش بەبێ زمان ،ئەگەر هەشبێ، بەردەوام دەبێت، یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکان ، کە مرۆڤ لەهەر گیانلەبەرێکی تر جیا دەکاتەوە، زمانە. زمان وەك





ئامرازێك، قەناتێکی چالاك ، چەند ئەرکێکی گرنگی هەیە.ئەرکەکان بەسەر دوو جۆر دابەش دەکرێن:

### یەکەم: ئەرکە مایکرۆییەکان

ئەو ئەرکانەی زمان لە چەند شێوازێ یان ڕێگەیەك بەدەردەکەون:

#### 1ـ ئەرکی سایکۆلۆژی زمان

با بزایین لەخێزان ئەم ئەرکە چۆن دەردەکەوێ :

ژنی ژیر و وشیار دەتوانێ هەردەم کەسێکی زۆر هێمن و دوور لەتوڕەیی و هەڵچوون لەناو ماڵەکەی بەرپابکات، قسەخۆشەکانی ژن هەتا پیاوی توڕە و بێمیزاژیش خاو دەکاتەوە.

گیانی وەرزشی حاڵەتێکی دی دەرخستنی لایەنی سایکۆلۆژی زمانە. هەوادارانی تیپێکی وەرزشی ، بەو هات و هاوارەی بۆ هاندانی تیپەکە دەریدەبڕن ، خۆیان خاڵی دەکەنەوە، بەمەش ئاسوودە دەبن.

#### 2ـ لایەنی کۆمەڵایەتی :

هەواڵ پرسین و چاك و چۆنی لە ئاخاوتنی ڕۆژانە و سەرەتای بونیادنانی کۆمەڵگایەکی پڕ ئاشتەواییە، سڵاوکردن هەر ئاشتی بڵاو ناکاتەوە، بەڵکو دەبێتە دەستپێکی کۆمەڵایەتی بۆ برادەرایەتی ، هاورێیەتی هەتا هاوسەرگیری!

لە زمانی نووسینیش هەرنامەیەك ئەگەر بە: ئازیزم ، بەڕێزم ،ڕێزدارم، دەست پێبکات و بە :برای دڵسۆزت، برای بچووکت ،کۆتایی پێ بێت ، کاردانەوەیەکی باشی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ.

#### 3ـ ئەرکی تۆمارکردنی لەپێناو مانەوە

تۆمارکردنی هەر ڕووداوێك لەمێژوودا ، هەر بە زمان دەبێ، ئێمە ئەگەر نووسراوەکانی سۆمەرییەکان و ئاشورییەکان نەبوایە، تەواو لەمێژووی خۆشمان

شارەزا نەدەبووین،ئەمە لەلایەك ، لەلایەكی تر هەر قەرزێك ئەگەر لە قەرزنامە تۆمارنەكرێ ئەوە چەندەها كێشەی كۆمەلایەتی لێ دەكەوێتەوە و بۆندی هاوسەرگیریش یەكێ لەو تۆمارانەیە ، كە ڕووسووری پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان دەپارێزێت .

**4 ـ دیاریكردنی ناسنامەی شتەكان**

دیاریكردنی ناسنامەی شتەكان ، كۆنترین ئەركی زمانە، ناولێنانی هەر پەیوەندیەكی خزمایەتی و هەر گیانەوەرێك هاریكاری مرۆڤ دەكات ، بۆئەوەی شتەكان بناسێتەوە، بەهەر پیاوێك بگوترێ باوك، ئەوە منداڵی هەیە ، بەهەر ژنێك بگوترێ (دایك) ، كچ نییە و شووی كردووە و نەزۆكێش نییە ! !

هەر كاتێ ناوی (شێر، پڵنگ، مار... هتد) دێت ، مرۆڤ موچركەیەكی بە لەشدا دێت و دەترسێ ئەگەر نەتوقێ و نەبورێتەوە، بەڵام ئەگەر ناوی (ئاسك) (بولبوول) و (چۆلەكە) بێت ، مرۆڤ دەچێتە ناو دنیای پڕ بەرائەتەوە !

**5 ـ ئەركی دەربڕینی هزر**

مرۆڤ بەر لەوەی هەر شتێك (بلێ) یان (بنووسێ) ، بیر دەكاتەوە، دالغەلێدان ،هزركردن قەناتێكی دی دەربڕینە، هەرچەندە هەمیشە (هزر و زمان) لە پەیوەندییەكی دیالێكتیدا نین ،بەڵام لەزۆربەردا زۆر پێكەوە گرێدراون .

**6 ـ پەیوەندیكردن**

پەیوەندیكردن بە قسە یان بە نووسین ئەركێكی هەرە گرنگی زمانە، ئەم ئەركە لەم چەند شێوازە دەردەكەوێت :

**1 ـ داواكردن** :

داواكردن بە ئاخاوتن و نووسین دەبێت، لە هەردووكیان جۆرە ڕێزێك هەیە لە نێوان قسەكەر و گوێگردا.





**بەیارمەتی خۆت چایەكمان بۆ ناهێنێ .**

**2 ـ پرسیاركردن:**

مەبەست لە پرسیاركردن دەست خستنی زانیارییە، بە واتای ئەوەی بەهۆی پرسیاركردنەوە قسەكەر دەتوانێ كەلێنێ یان چەند كەلێنێك لە زانیاری خۆیدا بەرانبەر دیاردەیەك پڕ بكاتەوە، لێرەدا قسەكەر زانیاری تەواوی لە بارەی شتێكەوە نییە، بەڵكو لە ڕێگەی پرسیارەوە دەگاتە زانیارییەكان، لەمەدا پرسیاركردن پێچەوانی هەواڵ گەیاندنە، چونكە لە ڕستەی هەواڵ گەیاندن قسەكەر زانیاری دەگەیەنێ‌و بڵاودەكاتەوە و، سەرچاوەی زانیارییە، كەچی لە پرسیاركردندا گوێگر سەرچاوەی زانیینە، وەكو :

**–كەی سینەما بەتاڵ دەبێ؟**

**–ئایا ئەمڕۆ دەوام هەیە؟**

**3 ـ داوای لێبوردن كردن :**

چەند دەربڕینێك هەن لە زمانی كوردیدابۆ دەربڕینی (پۆزش) و (لێبوردن) بەكاردێن. هەروەها لەمجۆرەدا قسەكەر ئەوپەڕی ڕێز بەكاردێنێ، چونكە هەڵەیەكی كردووە یان بە هەڵە لە شتێك گەیشتووە .

**ببورە قەلەمەكەتم ون كرد.**

**ـ ببورە پێم لەپێت نا .**

**ـ ببورە ئەم ڕۆژە دەرفەتم نەبوو پێكەوە دابنیشین .**

**4– زانیاری و هەواڵ گەیاندن:**

بە ئەركێكی سەرەكی زمان دادەنرێت، كە بەهۆییەوە مرۆڤ لە دەوروبەری خۆی دەدوێ، واتە لێرەدا قسەكەر سەرچاوەی بڵاوكردنەوەی زانیاری‌وهەواڵە، لەم جۆرە قسەكەر دەیەوێ بوون‌و نەبوونی یان ڕاستی‌و ناڕاستی دیاردەكان پیشان بدات.

لەهەمان کاتیشدا ڕستەکانی هەواڵ گەیاندن مەرج نییە هەر ڕاست بێت، بەڵکو دەشێ هەڵەبێت، چونکە لێرەدا ئەرکی قسەکەر تەنیا گەیاندنی زانیارییە، وەکو:

**—هەنگوین شیرینە.**

**—ڕاستی خۆشە.**

**—بەیانی حکومەت دادەمەزرێ .**

**ـ دووسبەی پەرلەمان دەست بەکاردەبێ .**

**5 ـ فەرماندان:**

لێرەدا قسەکەر داوا لە گوێگر یان کەسێك دەکات بە ئەنجامدانی یاخود کردنی کارێك، وەکو:

**—پەنجەرە داخە.**

**—نانەکە بخۆ.**

واتە قسەر بڕیاردەری کارەکەیە، بەڵام گوێگر دەبێ جێبەجێی بکات.لەم جۆرەدا گوێگر چاوەڕێی ئەوە ناکات تاکو بزانێ ئەم ڕستەیە ڕاستە یاخود هەڵە ، چونکە فەرماندان پەیوەندی بە ڕاستی و ناڕاستییەوە نییە.

**6 ـ ڕاپەڕاندن**

مەبەست لە ڕاپەڕاندن ئەوەیە کە قسەکەر خۆی بە ئەنجامدانی کارەکە هەڵدەستێ، واتە لێرەدا ڕاپەڕاندن پێچەوانەی فەرماندانە، چونکە لە فەرماندان قسەکەر داوای لە گوێگر دەکرد کارێك بکات، کەچی لێرەدا خۆی بە کارەکە هەڵدەستێ، وەکو:

**—سوێند دەخۆم کە ڕاستی بڵێم.**

**—بەڵێن دەدەم ئەم کارە بکەم.**

**7 ـ پەسند کردن**

لێرەدا قسەکەر بڕیاری ڕەهای بە دەستە، هەندێجار دیاردەی پەسندکردن لە هەڵێنان سەرچاوە دەگرێ.





**ـ بڕیارەکە پەسند دەکرێت .**

**ـ بێ دەنگی ئەو ، نیشانەی قەبووڵکردنە.**

**8 ـ ڕەتکردنەوە**

قسەکەر دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە هەر داوایەك ، قسەیەك ڕەتبکاتەوە ، ئەمجۆرە دەربڕینە ، دەربڕینێکیزبرە یان هەر هیچ نەبێ بۆ گوێگر دڵخۆشکەر نین.

**ـ حکومەت داواکەمی ڕەتکردەوە.**

**ـ ئەوان بەهیچ ڕازی نابن .**

**9 ـ خۆشی دەربڕین**

ئەم ئەرکەی زمان لەشیعر زیاتر دەردەکەوێ ، بەتایبەتی لە جوانکاری و ڕەوانبێژی و خۆشخوانی ،چونکە ئەم ڕەگەزانەی ئەدەب دەروون ئاسوودە دەکەن .

**ـ ئەم شیعرە تەڕانەی گۆران بەرد بە جووڵە دێنن .**

**ـ بەدیار غەزەلەکانی نالی یەوە خەوم لێدەکەوێ !**

**ـ ئەو شیعرانەی ئەو دەموروژێنن .**

**دووەم:ئەرکە ماکرۆییەکان**

ئەم جۆرە ئەرکانەی زمان ، وەك ئەرکە مایکرۆییەکان نین، لەسەر ئاستێکی بچووك لە زمان بڕوانن ، بەڵکو لێرە زمان فەزایەکی فراوانی هەیە، ئەم جۆرە ئەرکەکانە لەم شێوازانە خۆیان دەنوێنن:

**1ـ ئەرکی زەینی ، ئایدیالی**

پرۆسەی وەرگرتن و تێگەیشتن لە چالاکی زەینی زمان، زۆر قورسە مرۆڤ بە سادەیی لە ژیان ناڕوانێ ، مرۆڤ ئەگەر ئەو توانا زەینیەی نەبێ ، چۆن دەتوانێ لەنێوان (غەیب) و (عەقڵ) هەڵبکات، مرۆڤی ساخلەم بۆ هەر ڕووداوێك لە بوونەوەر

لەخۆی بەهۆی زمانەوە حاڵی دەبێت: بۆچی هاتم ؟ بۆچی هەم ؟ بۆ کوێ دەچم ؟ ئەوە هەر بۆ لۆژیکی زمان پەی بەو پرۆسە زەینیەی زمان دەبردرێت.

### 2 ـ نێو خودیی

زمان ئەرکێکی نێو خودیی هەیە، وەکو لەم ئەرکە دەردەکەوێت ، کە زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، چونکە چ لە مۆنۆلۆژ و دایەلۆگ ، کەسایەتی ئاخاوتنکەر دەردەکەوێ . کەسایەتی مرۆڤ بەندە بە زمانییەوە، هەروەها هەر لەڕێگەی زمانەوە گوێگر دەتوانی ئاستی مەعریفی قسەکەری بۆ دەربکەوێت.

### 3 ـ شیعریەت :

شیعریەت توانای نووسینی شیعر ناگەیەنێ، بەڵکو واتای بەکارهێنانی زمان بۆ ئەفراندن و داهێنان دەبەخشێ ، مرۆڤی خاوەن بەهرە و داهێنەر ، بەهۆی مەجازەوە دەتوانێ یارییەکی هونەری جوان بە وشەوە بکات، ئەمەو شێوازی وتنی (نوکتە) و (مەتەڵ)یش شیعریەت دەگەیەنن ،چونکە وا لە بیسەر و گرێگر دەکەن، بەهۆی وشەوە بەدوای وەڵامدا بگەڕێت ،هەر مەتەلێك تێڕامانێکی دەوێت، هەر تێڕامانێکیش پێویستی بە وشەیە .

### 4ـ دەق دروستکردن :

هەموو مرۆڤێك ناتوانێت ببێتە دەق نووس ، دەق بە واتای بەهرە ، بیرۆکە دەربڕین، داهێنان، دێت ، تەنیا ئەو مرۆڤانە دەتوانن سنووری (ڕستە) ببڕن ، کە کەرەسەکانی زمانیان دەولەمەندەو دەزانن وەستایانە ئامرازەکە بەکاربێنن.

## نەژادی زمان لەنێوان گریمانەی مرۆڤ و خەڵاتی خودادا

دەرککردن بە زمان و هەستیاری زمان لە مرۆڤدا ،مێژوویەکی هەیە، دژوارە بتوانرێ دیاری بکرێت، مرۆڤ وەك جەستەو عەقڵ لەهەموو بونەوەرێکی تری سەر





زەوی جیابووە، ئەو جیابوونە مرۆڤی وا لێکردووە ، هەردەم لەگژ فکراندا بێت و ئامانج لەبوونی خۆی بۆ دەربکەوێ.

کە کۆمەڵگا دروست بوو، دەستوور و دەوڵەتیش دروست بوون، دەستە هەڵبژاردەی مرۆڤ لە زانایان و هزرمەندان و ئاییندارانی هەوڵیاندا لەدوو ئاڕێشەی زمان بکۆڵنەوە، یەکەم/ ئایا زمان خوا کردە یان مرۆڤ کردە. دووەمیش کام زمان یەکەم زمانە.

لەم بەشە بەکورتی جەخت لەسەر هەردوو پێکۆل دەکەین، بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنییەی جیهانی زمانی مرۆڤ ، ئەم دوو کێشەیەش مرۆڤ بە (عەقل) و (تێکستی ئاسمانی) شرۆڤەیان کردووە، ئێمە لە گریمانەکانی مرۆڤ دەست پێدەکەین:

## یەکەم:گریمانەکانی مرۆڤ

چەندەها گریمانەو (تیۆر) لێرەو لەوێ لەسەر نەژادی زمانی مرۆڤ و چۆنیەتی پەیدابوونی نووسراون، دەکرێ بەکورتی ئاماژە بە هەندێکیان بکەین و شرۆڤەیان بکەین:

### 1ـ گریمانەکانی لاسایی کردنەوەی دەنگەکانی سروشت

**أ ـ تیۆری** Bow – Bow

بەگوێرەی ئەم تیۆرە ، ڕۆنانی وشە بەهۆی لاسایی کردنەوەی زایەڵەی دەنگەکانی سروشت پەیدابووە. ئەو دەنگە سروشتیانە ناوەندێك و هۆکارێك بوون، بۆ ئەوەی مرۆڤ زاری ببێتەوە و لاسایی دەنگی ئاژەڵ و ڕووبارو بروسکە... هتد. بکاتەوە.

**کەموکورتییەکانی ئەم تیۆرە:**

1ـ زمان هەر تەنها کۆمەڵە وشەیەك نییە ، تەنها پەیوەست بێ بۆ ناوی شتەکان.

2ـ مرۆڤ ئەگەر ناوێکی بۆ ئەو دەنگانە دانابێت، ئەی بۆ "شتە بێدەنگەکان" وەك (دار، بەرد)، هەروەها بۆ هەست و سۆزی خۆی چی داناوە؟!

3ـ دەنگی سروشتی لەهەموو دنیا وەك یەکە، بۆ نموونە:

ـ پشیلەی هەموو دنیا دەمیاوێنێ

ـ شێری هەموو دنیا دەنەڕێنێ

ـ کەری هەموو دنیا دەزەڕێنێ

ـ مانگای هەموو دنیا دەبۆڕێنێ

ئەی بۆ مرۆڤەکان فێری زمانی جیاواز بوون ،هەموو ئەو گیانەوەرانە تەنها فێری یەك زمان نەبوون؟

**ب ـ تیۆری** Yo – heave – no

کۆششی فیزیکی یاخود هێز و شەنگی مرۆڤ و ماسولکەکانی ، کە دەبێتە هۆی نرکاندن و ناڵین و مرخاندن، وای لە مرۆڤ کردووە ، کە زمانی بەکاربێنێ. ئەم دیاردەیە زیاتر لە دەوروبەری کۆمەڵایەتی بەرپایە ، بەو واتای مرۆڤ ناڵە ناڵەی کردووە یاخود تیقە تیڤی کردووە یان فینگە فینگی کردووە ، ناچار بووە بە بەرانبەرەکەی بڵێ کە چییەتی!

وێڕای ئەوەی ئەم تیۆرەش کێماسیەکانی ئەوەی پێشووی هەیە، هەروەها هاواری کۆمەڵایەتی هۆکار نییە بۆ ئەوەی ئاخاوتن دروست ببێت ، چونکە ئەوەتە مەیمون وەك مرۆڤ هاواری کۆمەڵایەتی (ناڵین)ی هەیە، بەڵام توانای پەرەپێدانی ئاخاوتنی نییە.

**ج ـ تیۆری هاواری سروشتی هەستەکان**

ئێش، ژان، خۆشی، خەم و کەسەر ، دەکرێ بە وشە گوزارشتیان لێبکرێت.وەك:





ئازار ـ ئای

خۆشی ـ واو

خەم ـ ئاه، ئاخ

کێماسی ئەم تیۆرە ئەوەیە بەوەندە هەستە زمانێکی سیستیماتیکی وەك مرۆڤ دروست نابێ، ئێش و خۆشیەکانی مرۆڤ سنوردارن ، ناکرێ زمان هەر تەنها ئێش و خۆشی بێت.

**2ـ تیۆری گەشەکردن**

ئەم تیۆرە باوەڕی وایە کە بنەمای بایۆلۆژی زمان ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە پەرەسەندنی زمانی مرۆڤد، (داروین) لە کتێبی (نەژادی بنەچەکان ) دەڵێت: "زمانی مرۆڤ و هاواری گیانەوەر تەنیا لە پلە جیاوازن. زمانی مرۆڤ وەك مرۆڤ خۆی بەشێوەیەکی زۆر بەراییەوە هاتووە، بەرە بەرە پەرەی سەندووەو پێویستییەکانی وای لێکردووە قسە بکات".

**کێماسییەکان**

1ـ ئەو ڕایەی (داروین) هیچ پەیوەندی بەنەوەی ئادەمیزادەوە نییە، چونکە نە مرۆڤ گەشەی کردووە، نە زمانەکەی،دۆزینەوەی مرۆڤی (ئاردی)ئەمەی تەواو ساغکردەوە.

2ـ ئەو ڕایەی (داروین) ئەوەندە نالۆژیکی بووە، بۆیە(ماکس مۆلەر)ی هاوچەرخی ، ناوی لەو تیۆرەی (داروین) ناوە ، تیۆری Pooh – Pooh.

3ـ بۆچی هاواری گیانەوەر پەرەی نەسەند و نەبووە زمان؟!

4ـ شتێك نییە بەناوی "زمانی بەرایی" ، بەڵکو ئەوەی هەیە ، کۆمەڵگای بەراییە.

## 3ـ تیۆری ئاماژەی زارەکی و ئاماژەی فیزیکی

ئەم تیۆرە بانگەشەی ئەوە دەکات کە کردە جەستەییەکانی مرۆڤ ، وای لە مرۆڤ کردووە ئاماژە زارەکییەکان وەك جوولاندنی زمان و لێوەکان، چاوەکان ، زمان دروست بکەن.

ئەم ئاماژانە زۆر سنووردارن، بۆیە ناکرێ سیستەمی پڕ ئاڵۆزی زمان تەنها بەوەندە کردارەوە پەیدا ببێت.

## 4ـ تیۆری کۆمەڵایەتی

کۆمەڵگا تاکە ناوەندی بە کۆمەڵایەتیبوونی زمانە، ئەوانەی باوەڕیان بەوەیە کە زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە ، دەڵێن مرۆڤ بە تەنیا لە (زمان) دەکەوێ و هەر بە (کۆمەڵگا) (بەزمان) دەکەوێتەوە.

ئەم تیۆرە هیچ هەڤدژییەکی لەگەڵ سروشتی پەیدابوونی زمان نییە، چونکە مرۆڤ لەناو کۆمەڵگا پێویستی بە زمان بووە.

## 5ـ ڕێککەوتن

زمانی مرۆڤ لەخۆوە دروست بووە، هەروەك چۆن بوونەوەر لەخۆوە دروست بووە، مرۆڤ خۆی داهێنەری زمانی خۆیەتی ، هەر ئەویش ناوی لە شتەکانی دەوروبەری خۆی ناوە، بێگومان لەڕووی زانستییەوە هیچ شتێ لەخۆوە دروست نابێت، زمانی مرۆڤیش بونەوەرێکی زیندووە، هەروا دروست نەبووە.

## 6ـ زمانی مرۆڤ، خواکردە

سەبارەت بە ژێدەری ئاسمانیی، زۆربەی ئایینەکان ئاماژەیان بە زمانی مرۆڤ کردووە، بۆ نموونە:





1ـ ئایینی میسرییە کۆنەکان

2ـ بابلییەکان

3ـ هیندۆسەکان

4ـ تاوەری بابل

5ـ ئینجیل و تەورات

6ـ قورئانی پیرۆز

ئێمە تەنها جەخت لەسەر قورئانی پیرۆز دەکەین، چونکە دوا نامەی ئاسمانە هەروەها وەك ئەوانی تر نەشێواندراوە.

پێکهاتەی مرۆڤ، بەتایبەتی مێشکی مرۆڤ ، وای لە زمانناسی نوێ کرد ، کە بواری زمانەوانی زۆر فراوان بکات، چونکە سیستەمی مێشك و عەقڵی مرۆڤ هەژموونێکی گەورەی بەسەر زمانی مرۆڤەوە هەیە، هەر بە هەدمەیەکی سادە لەو هەموو تۆڕەی دەمار، زمان دەشێوێنێ و (ئەفاسیا) دروست دەبێ، هەروەها هەر لە مێشکی مرۆڤدا ئامێرێك هەیە بەناوی ئامێری وەرگرتنی زمان.

ئەم ئامێرە لەهیچ گیانەوەرێکدا نییە ، هەر ئەوەش وایکردووە مرۆڤ هەم (قسەکەر) بێت ، هەم توانای فێربوونی هەموو زمانێکی ببێت، بۆ نموونە ئەگەر منداڵێکی کورد لە کۆمەڵگایەکی ئەمریکی پەروەردە بکرێت ، ئەمریکی فێر دەبێت، بەڵام ئەگەر سەگێك، پشیلەیەك... هتد، لەگەڵ ئەو منداڵە بچێتە ئەمریکا، هیچ گۆڕانێکی لێ ڕوونادات ، هەروەك سەگ و پشیلەی کوردی دەحەپێنن و دەمیاوێنن.ئایەتی "وعلم ادم الاسماء کلها" بە هەردوو ڕاڤەیەوە:

1ـ خودا ناوەکانی فێری مرۆڤ کرد.

2ـ خودا ناولێنانی شتەکانی فێری ئادەم کرد.

تەواو لەگەڵ پێکهاتەی مرۆڤ یەکدەگرنەوە، ئەو توانایەی ئادەم، فریشتەو جنۆکەکانی سەرسام کرد ، لە ئاکام سەری ڕێزی نوازشت و سوژدەی ڕێزیان بۆی برد.

ئەو توانایەی مرۆڤ بۆ (دەربڕین) و (ناولێنان) و (قسەکردن) تەواو لەگەڵ زمانەوانی نوێ یەکدەگرێتەوە و تەواوی ئەو گریمان و تیۆرانە هەڵدەوەشێنێتەوە ، کە پەیدابوونی زمانی مرۆڤ بەلاسایی کردنەوەی سروشتەوە دەبەستنەوە.

دروستبوونی ئادەمیش سەرەتای دروست بوونی کۆمەڵگا بوو، تاکەکانی کۆمەڵگاش، بەتایبەتی مرۆڤ کە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، بەبێ بەکارهێنانی زمان ناتوانن تەواو لەیەك بگەن، بەگوێرەی ئەو ئەزموونانەی لەسەر منداڵان کراوە، ئەوە دەردەکەوێ کە مرۆڤ دوور لە کۆمەڵگا، نەك هەر لە زمان دەکەوێ، بەڵکو ڕەفتار و گوفتاری مرۆڤانەشی نامێنێت.

## * نەژادی زمان ونەژادی نەتەوە

پرسی زمانی ئادەم و خودا چەندەها لێکدانەوەی بۆ کراوە،خودا بەچ زمانێك قسەی لەگەڵ ئادەم کردووە؟ ئادەم بە چ زمانێك قسەی لەگەڵ خودا کردووە؟ ئادەم بە چ زمانێك قسەی لەگەڵ حەوا کردووە؟ دوو پرسن هیچ پەیوەندییان بە زمانەوانییەوە نییە، چونکە هیچ ئایەتێك نییە ئەمە ڕوون بکاتەوە ، هەروەها هیچ زانستێك هەتا مرۆڤناسیش نەیانتوانیوە وەڵامی ئەو دوو پرسیارە بدەنەوە.

ئەوەی هەیە هەموو گریمانەو ئەفسانەیە، ئەو قسانەش هیچ شەنگست و بنەمایەکی زانستیان نییە، وێڕای ئەمەش کارکردن و خۆ خەریککردن بەو مەسەلەیەوە دوو ئاڕیشەی لەناو کۆمەڵگا دروستکردووە: نەتەوەی پیرۆز و زمانی پیرۆز ، جولەکەکان یەکێ لەو نەتەوانەن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە زمانی عیبری زمانێکی پیرۆزە





،چونکە ئادەم قسەی پێکردووە. ئەلمانەکانیش بەپاساوی ئەوەی ئەلمان بەشدارییان لە بورجی بابل نەکردووە، بۆیە خودا زمان و ڕەگەزی ئەوانی پیرۆز کردووە، عەرەبەکانیش یەکێ لەو نەتەوانەن زۆر شانازی بە ڕەگەزو زمانی خۆیان دەکەن ، هەتا دەڵێن زمانی بەهەشتیش بە عەرەبییە!! ، ئێزیدییەکانیش دەڵێن ئێزدان بە کوردی لەگەڵ مەلیکی تاوس قسەی کردووە !

لەڕووی ئایینی و زمانناسییەوە ، نە هیچ ڕەگەزێك پیرۆزە، نە هیچ زمانێك . هەموو زمانەکان وەك یەکن، زمانێك نییە لە زمانێکی تر پێشکەوتوو تر بێ، زمانێك نییە بە ناوی زمانی بەرایی بێت، هەموو زمانێکیش لە وشە پێکهاتووە، جا ئەوەی وشەی زۆرە ، ئەوە دەرفەتی زۆری هەیە، ئەوەی وشەشی کەمە دەرفەتی نەدراوەتێ.

## ئەدگارەکانی زمانی مرۆڤ

چەمکی زمان، چەمکێکی لێڵە، لەزۆربەی زمانەکاندا ئەو چەمکە بوارەکەی هێندە فراوان کراوە ، بەجۆرێ زۆر سنووری بڕیوە، وایلێکراوە، کە هەتا شتی نازیندووش زمانی هەبێت، ئەو دیتن و خوێندنەوە فراوانە بۆ زمان، بەهای سروشتی زمانی شێواندووە. دەگوترێ زمانی گیانەوەر، زمانی مۆسیقا، زمانی ترافیك لایت، زمانی جەستە.ئایا ئەوانە زمانن؟! زمان هێندە سادەیە؟ زمان کۆمەڵێك ئەرك و دەسەڵاتی هەیە، بەهیچ جۆرێ گیانەوەر و مۆسیقا و ترافیك لایت و جەستە هتد. ناتوانن گوزارشتی لێبکەن.

زمانی مرۆڤ ، ئەو زمانەیە کە کرۆکی زمانەوانی پێکدەهێنێ، ئەو زمانە هەندێ ئەدگار و تایبەتمەندی هەیە، کە بە کورتی لە هەر یەکێکیان دەدوێین و لە کۆتایی لەگەڵ زمانی گیانەوەر بەراوردی دەکەین:

## 1ـ لادانی شوێنکات

زمانی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە نەك هەر لەو شتانە بدوێت ، کە لە (ئێستا) و (ئێرە) ڕوودەدەن، بەڵکو دەتوانێ باسی ڕووداوێك بکات ، هەزاران ساڵ پێش ئێستا ڕوویدابێ ، هەروەها باسی شتێك بکات کە لە داهاتوو ڕوودەدات.

وێڕای ئەوەش زمانی مرۆڤ دەرك بە شتە غەیبیەکانیش دەکات ، مرۆڤ دەتوانێ باسی (بەهەشت) و (دۆزەخ) و (فریشتە) و (جنۆکە) بکات، هەروەها گوزارشت لە (خۆشی) و (ترس) بکات.

هەرچی زمانی ئاژەڵە ئەوە زۆر کاتیی و سنووردارە ، هەر دەتوانێ گوزارشت لە (ئێستا) و ئەو شوێنە بکات ، کە شتەکەی لێیە یان ڕووداوەکە ڕوودەدات.

پشیلەکەت کە لەبەر پێت میاو میاو دەکات ، ئەوە تەنها ئەوەت پێ دەڵێ کە ئێستا نەك دوێنێ یاخود بەیانی برسیەتی، تێنیوەتی. حەوحەوی سەگەکەشت ، تەنها ئەوەت پێ دەڵێ کە ئێستا برسیە، تێنووە، ترسێك لە دەرەوەیە !

ئەگەر هەنگ بەهۆی چەند سەمایەکەوە بتوانێ شوێنی شیلەی گوڵێك بە هەنگەکانی تر بڵێ، نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئاژەڵ توانای هەیە لە سنووری کات و شوێنی ئێستا دەربچێ، ئەو توانایە هێندە سنووردارە ، بە هیچ جۆرێ ناکرێ زمانی مرۆڤ و ئەو سەما و هاوارەی گیانەوەر بە جیاوازی لە پلە نەك لە جۆر بەراورد بکرێ.

## 2ـ لەخۆوەیی

ئەم ئەدگارەی زمانی مرۆڤ ئەوە دەردەخات کە هیچ پەیوەندییەکی سروشتی لەنێوان (وشە) و ئەو (شتە)ی لە سروشتدا هەیە، نییە، وشەی (مار) لە نووسین و گۆکردن، هیچ پەیوەندی بە شێوەی (مار)ەوە نییە.بەواتای ئەو (هێما) و





(هێمابۆکراو) لە زەینی مرۆڤی هۆشیارەوە هیچ پەیوەست نین بەیەکەوە، بەڵام ئەو پەیوەندییە هێماییە لە زەینی مرۆڤی نەخوێندەوارەوە بەشێوەیەکی ترە ، بەواتای پەیوەندییەکی سروشتی هەیە لەنێوان (وێنەی مار) و (مار)ی ناو دارستان، بێگومان ئەمەش پەیوەستە بە عەقڵی ئەو جۆرە مرۆڤەوە، کە ئەگەر نەخوێنەوار بێت، پەیوەندییەکان، وەك گیانەوەر، بە پەیوەندییەکی وێنەیی نەك هێمایی دەبینێ !

ئەم دیاردەیەش ساغلەم نییە، بۆیە نەبوونی هیچ پەیوەندییەکی سروشتی لەنێوان (وشە) و ئەو (شتەی) دەینوێنێ ، نەك هەر زمانی مرۆڤی جیاکردۆتەوە، بەڵکو فاکتەرێکیش بووە بۆ ئەوەی چەند (زمان) و (نەتەوە) دروست ببن، بۆ نموونە ئەگەر بۆ هەر (شتێك) لە سروشت وشەیەك هەبوایە، ئەوە دەبوو هەموو مرۆڤایەتی بۆ شتێکی وەك (سەگ) یەك وشەی جیهانیان بەکارهێنابایە، نەك کورد بڵێ (سەگ) ،عەرەب بڵێ (کلب)، ئینگلیز بڵێ (dog).

هەندێ دەنگی سروشتی هەن، وەك قڕە قڕ، وڕە وڕ، قیڕە قیڕ، وژە وژ و کیڤە کیڤ ، ئەو شتانە دەنوێنن کە لە سروشتدا هەیە، بەڵام ئەمەش زۆر سنووردارە .

## 3ـ ئەفراندن

ئەفراندن و داهێنانی وشەی نوێ ، ئەدگارێکی تری بێ وێنەی زمانی مرۆڤە، مرۆڤ دەتوانێ بۆ هەر ڕەوشێك لەهەر کاتێك ، وشەیەك بۆ ئەو شتە دابهێنێ ، کە تووشی دەبێ ، ئەدگاری داهێنان لە (زەین) و (عەقڵ)ی مرۆڤدا بوونێکی ئەزەلیە، هەر بۆیە مرۆڤ ڕۆژانە دەتوانێ وشەی نوێ، ڕستەی نوێ ، کە پێشتر کەس گوێی لێ نەبووە، دابهێنێت.

ئەو توانستەی مرۆڤ بەهیچ جۆرێ بەراورد ناکرێ بە زمانی ئاژەڵانەوە، هۆیەکەش ئەوەیە زەخیرەی زمانەوانی ئاژەڵ سنووردارە و تەنها چەند هێمایەك لەخۆ دەگرێ، بۆیە قسەی ئاژەڵان پرۆسەیەکی کاوێژکردنەوەیە.

بە ئەزموون دەرکەوتووە ئەو هەنگەی بە چەند سەمایەکەوە دەتوانێ شوێنی شیلەی گوڵێك بۆ هاوەڵانی دیاری بکات، ئەگەر شوێنەکەی بگۆڕی، دەستەوەستان دەبێ ، بەتایبەتی ئەگەر شیلەکەی لە دووریەکی بەرز دابندرێت، چونکە وەك دەرکەوتووە، وشەی یان هێمای (سەرەوە) (بەرز) لە زمانی هەنگدا نییەو ناشتوانێ دایبهێنێت.

### 4ـ گواستنەوەی کەلتوریی

زمان کەلەپورێکی جیناتی (بۆماوەیی) نییە، بەڵکو کەلتورێکە منداڵ لە کەلتور فێری دەبێ، بێگومان حەزی فێربوونی زمان سروشتییە، بەڵام فێربوونی جۆری زمان کەلتورییە، لەم ڕوانگەوە دەتوانین بڵێین منداڵ هەندێ ئەدگاری بۆماوەیی لەدایك و باوکییەوە وەردەگرێ ،وەك (ڕەنگی چاو، ڕوخسارو پرچ هەتا هەندێ ئەدگاری وەك هێمنی و تووڕەیی... هتد، بەڵام زمان لە کەلتورەوە فێر دەبێ، لێرە گرنگە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە مەرج نییە دایك و باوکێکی کورد منداڵەکەیان بە کوردی بدوێ ، ئەگەر ئەو منداڵە لە کۆمەڵگایەکی عەرەبی یاخود ئینگلیزی پەروەردە بکرێ ! منداڵی کورد جیناتی کوردانەی دایك و باوکی هەڵناگرێ، بۆیە کە لە ناو کەلتورێکی نا کوردی بەخێو دەکرێ ، هیچ وشەیەکی کوردی نازانێت.

لەم ئەدگارەی زمانی مرۆڤ دەفامرێتەوە، کە مرۆڤ بەهۆی ئامێری وەرگرتنی زمان ، فێری زمان دەبێ، ئەو ئامێرە هیچ مۆرکێکی نەتەوەیی هەڵناگرێ ، چونکە





فێربوونی زمان لەبنەڕەتدا پرۆسەیەکی نەتەوەیی نییە، بەواتای بۆنموونە کەس بە کوردی لەدایك نابێ، لەپاش بوون لە کەلتوری کۆمەڵگاوە فێری زمان دەبێت!

ئەمەو ئەو ئامێرەی وەرگرتنی زمان لە منداڵ و لاواندا زۆر چالاکە ، لەیەك کاتدا توانای فێربوونی چەند زمانێکی هەیە، بەڵام هەرچەند مرۆڤ بچێتە تەمەنەوە ، ئەو ئامێرەش لە وەرگرتنی زمان و زمانی نوێ تەمبەڵتر دەبێت.

گیانەوەران ئەو توانایەی فێربوونیان لەگەڵ مرۆڤ هەر نییە لەناو خۆشیان زۆر دەگمەنە ، ئەوەتە سەگ نزیکترین هاوڕێی مرۆڤە ، تەنها (هێما) و (وێنە) لە مرۆڤ فێر دەبێت، جا ئەو مرۆڤە لەهەر نەتەوەیەك بێت گرنگ نییە، هەروەها جگە لە (حەوە حەو) و جێ بەجێکردنی فەرمانەکان هیچی تری پێ ناکرێ ، بەهیچ جۆرێ ناتوانێ وشەیەکی مرۆڤ هەتا لاسایش بکاتەوە.

گیانەوەران لەناو خۆشیاندا ناتوانن سنوری (ناسنامە) و (زمان)ی خۆیان ببەزێنن، بۆ نموونە ئەگەر (کتکە پشیلەیەك) لەناو هەندێ (گوجیلە سەگ) بەخێو بکرێ ، ئەوە هەر (میاوە میاو) دەکات نەك (حەوە حەو).

بەکورتی، هۆکاری زگماك، زمانی زگماك، زمانی دایك و باوك، زمانی نەتەوە، ئەوکاتە لە مرۆڤدا دەردەکەوێ، کە لەناو کۆمەڵگای خۆی پەروەردە بکرێ، ئەگەرنا زمانی نەتەوە لە ئامێری وەرگرتنی هەر منداڵێکدا نییە، هەر لەو ڕوانگەوە بە بەڵگە ڕوون بۆتەوە ، ئەو منداڵەی (بەتەنیا) بەخێو بکرێ ، بەهیچ جۆرێ بە (زمانی زگماك) نادوێ ، هەروەها ئەو منداڵانەی لە منداڵییەوە لە کۆمەڵگایەکی تر بەخێو دەکرێن ،زمانی زگماکیان دەفەوتێ.

### 5ـ دوالیتی ـ دووانە

زمانی مرۆڤ لە زگماکەوە لەسەر دوو ئاست ڕێکخراوە،ئەو دوو ئاستەش بریتین لە ئاستی دەنگیی (دروستکردنی دەنگی جودا ) و ئاستی واتا (پرۆسەی لێکدانی

دەنگەکان)، بەهۆی ئەو دوو ئاستەوە مرۆڤ دەتوانێ بەهۆی چەند دەنگێکەوە ژمارەیەکی یەکجار زۆر وشە دروست بکات کە هەموو لەیەکتر جودابن، لەزمانی مرۆڤدا هەبوونی دوو دەنگی جیا دوو وشەی جیاوازی لێدەبێتەوە، ئەو نموونانەی خوارەوە ئەم ئەدگارەی زمانی مرۆڤ زیاتر ڕوون دەکەنەوە:

هەریەك لەدەنگی /ك/ و /گ/ دوو دەنگی بێ واتان ، ئەگەر بەتەنیا بن، هەروەها هەردووك لەیەك جیان چونکە شێوازی دروستکردنیان جودایە، هەروەها بۆ ئەوەی بسەلمێنین ئەو دووە لەیەك جودان لە لێکدانیان لەگەڵ دەنگی تر بەدەر دەکەوێ:

ك + ا = کا

گ + ا = گا

ك + وێ = کوێ

گ + وێ = گوێ

ك + ۆ = کۆ

گ + ۆ = گۆ

ئەو کۆمەڵە وشەیە لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا ، هەریەکە نەك هەر واتای خۆی هەیە، بەڵکو یەکەیەکی سەربەخۆیە ، هەتا هیچ پەیوەندییەکی فۆنیمیشیان بەیەکەوە نییە.

لەم نموونەیەی خوارەوە دەردەکەوێت کە لە تەنیا هاوبەشیکردنی بزوێنی کوردی لەگەڵ دەنگێکی وەك /س/ ، چەند وشەی نوێ دروست دەکەن ، کە هیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نییە:

س + ە = سە (سەگ)

س + ی = سی (ژمارە (30) و سیەکانی مرۆڤ)

س + و = سو (ریبا)





س + وو = سوو (سوێ) (سولێبوونەوە)

س + ۆ = سۆ (بۆن سۆ ـ سوتان)

س + ا = سا (ئەوجا)

س + ێ = سێ

لەڕووی زمانەوە، مرۆڤ بەهۆی هەبوونی ئەو دوو ئاستەوە ، بۆتە ئاخێوەر، هەرچی زمانی ئاژەڵانە لەهەنبەر مرۆڤدا ناتوانێ لە ئاستی دەنگیی دەربچێت، ئەو ئاستەش هەر زۆر سنوردارە بۆ کۆمەڵێك شتی جودا هەریەك دەنگ هەیە، ئەو دیاردە پۆلیسیمیەی Polysemy زمانی ئاژەڵان لێڵی و تارمایی لەلای مرۆڤەوە دروست دەکات: قیژە قیژ و قیڕە قیڕ و کیڤە کیڤ و میاوە میاو و حەوە حەو ، هەر تەنها یەك (شت) برسیەتی، تێنویەتی، ترس، ئێش، ژان، نەخۆش، خۆش) ناگەیەنن ، بەڵکو ئەو هەمووە دەنوێنن.

## 6ـ قاڵبی ناوەکیی زمان

زمانی مرۆڤ تۆڕێکی زانیاریدەری ئاڵۆزە، هەرچی لەو تۆڕە دابێت (دەنگ، وشە، ڕستە) بەگوێرەی سیستەمێکەوە بەڕێوە دەچێت، هیچ ڕەگەزێکی ناو ئەو سیستەمە بە (موو) لە بنەمەکان و ڕێنماییەکانی ئەو سیستەمە لانادات.

لێرە ئاستی مەعریفی مرۆڤ دەوری خۆی دەبینێ ، لەسەر دیارکردنی (ناسنامە) و (بەها)ی ئەو ڕەگەزانە دەکرێ ئەو سیستەمە بە سیستەمی یاری تۆپێن بەراورد بکەین، هەرچی یاریکەر هەیە لە دەرەوەی یاری ،هیچ ناسنامە و بەهایەکی نییە، بەڵام کە دێنە ناو گەمەکەوە ،بەها و ناسنامەی خۆیان وەك گۆڵچی، هێرشبەر، بەرگریکار... هتد. وەردەگرن.

وشەکانی زمانیش هەر جۆرێکی بەشەکانی ئاخاوتن بن، ئەوکاتە دەبنە ڕەگەزێکی خاوەن (ئەرك) و (ناسنامە)، کە هاتنە ناو تۆڕی (ڕستە)ەوە ـ وشە لەناو ڕستەدا دەبێتە (بکەر) و (بەرکار) و (تەواوکەر) نەك لە دەرەوەی ڕستەدا.

ئەم ئەدگارەی زمانی مرۆڤ لەسەر هەموو ئاستەکانی زمان دەردەکەوێت:

## یەکەم: ئاستی دەنگسازی

لەنێوان هەردوو دەنگی /ش/ و /ر/ بەهۆی (هەندێ)، (نەك هەموو) بزوێنەوە چەند وشەیەکی جیاواز دروست دەبن وەك:

ـ شار، شیر، شێر، شۆر، بەڵام شەر، شور، شوور لە زاری ستاندەردا نین، هەروەها لە زمانی کوردیدا دیاردەی هێشووەنەبزوێن زۆرە، بەڵام هەموو جۆرە هێشووە نەبزوێنێك لە سیستەمی دەنگی زمانی کوردیدا جێی نابێتەوە:

ـ شتسر

ـ شکر

ـ شڤر

ـ شفر

ـ شقر

## 2ـ ئاستی وشەسازی

ڕۆنانی وشەی ئینگلیزی بەچەند ڕێگەیەکەوە دەبێت وەك:

1- Compounding لێکدانی دوو وشە یان زیاتر

- boy + Friend = boyfriend





- break + fast = breakfast

2- Derivation داڕشتن

- teach + er = teacher
- gang + dom = gangdom
- king + dom = kingdom

3- Invention داهێنان

Kodak
Nylon

4- Echoism زایەڵە

Whisper
Moan, hiss

ئەم دیاردەیە لەزمانی کوردی زۆرە وەك:

قیرە قیر، گرمەگرم، ڕمبە ڕمب

5- Clipping
Lab, disco

6- Acronomy
Mp, Nato, Radar

7- blending
- autobus, gasohol

8- Back formation
Greed, hedgehop

9- folk etymology
- female, let ball

10- Antonomasia
Sandwich, hamaburger

11- Reduplication
Lovey – dovey, tiptop

ئەم هەموو شێوازەی ڕۆنانی وشە لە ئینگلیزیدا ، بەگوێرەی سیستەمێك بەڕێوە دەچێ، لەپاشانیش لەلای خەڵك دەبێتە وشەیەكی مانادار، بۆ نموونە بۆچی ئینگلیزی وشەی breakfast تێشت ـ دروستکرد ، "fastbreak" دروست نەکرد، ئەوانی تریش بەهەمان شێوە.

ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردی بەو هەموو شێوازە دروست نابێ، بەڵکو تەنها چەند ڕێگەیەکە، وەك:

1ـ لێکدان: ڕووگرژ ،سەرخۆش، کرێکار، جووتیار..........

2ـ داتاشین: شازادە، میرزا، شمەك............

3ـ دارڕتن: هەڵگرتن، داگرتن، بردنەوە.............

4ـ کورتبڕی: ك. کردار، ب ـ بکەر، ئا. ئاوەڵناو..........

یان شێوەی تر ،وەك:

ی. ن. ك

پ. ك. ك

پ. د. ك

5ـ دروستکردنی ناو لە ناوی شوێن:

سەفین، گۆیژە، هەڵگورد، بێستوون.......

6ـ هەندێ ڕێگای تر هەن، کە کورد ئەو وشانەی لەو بوارانەدا نەبووە، بۆیە لەزمانی تر وەریگرتوون: سینەما، سانسۆر، کۆمپیوتەر، ئەنتەرنێت، تەلەفزیۆن، تی ڤی ..........هتد.

لێرەدا با چەند پرسیارێك بکەین:

1ـ بۆچی کورد وشەی (یارجووت، کارکرێ، پێدەر، شاددڵ)ی دروست نەکرد،کەچی (شێردڵ و دڵشێر)ی دروست کرد؟.





2ـ بۆچی کورد ئەو هەموو ڕێگایانەی ڕۆنانی وشەی نییە ؟!

بەکورتی هەر زمانێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، چۆن هەندێ هێشووە نەبزوێن لە ئینگلیزی نین ، لە کوردی هەن، بە پێچەوانەش، لەڕووی وشەسازیش هەروایە، ئەوەی سیستەمی زمانی کوردی قەبوڵی دەکات، ئەویتر قەبوڵی ناکات، بەپێچەوانەش. بێگومان شتی هاوبەشیش لە زمانەکاندا هەیە، بەڵام هیچ (دوو) زمانێك وەك یەك نین.

**3ـ ئاستی ڕستەسازی**

پێکهاتەی ڕستەسازی کوردی لەگەڵ ئینگلیزی جودایە:

ئینگلیزی: بکەر، کار، ئاوەڵکار

The clerk sneezed loudly

کوردی: بکەر، ئاوەڵکار، کار

ئاوەڵکاری ئینگلیزی زۆر لەوەی کوردی ئازادترە، دەکرێ بەم چەند شێوەیەش بێت:

ـ بکەر، ئاوەڵکار، کار — The clerk loudly sneezed

ـ ئاوەڵکار، کار، بکەر — loudly sneezed the clerk

لەگەڵ ئەو هەموو ئازادییەش، بەڵام لەوە زیاتر زمانی ئینگلیزی قەبوڵی ناکات و ڕستەکە بە ناڕێزمانی دادەنێت.

لەکوردی دەڵێین:

ـ ئازاد خێرا هاتەوە.

* ئازاد هاتەوە خێرا.

* خێرا هاتەوە ئازاد.

ئەمەو لەزمانی کوردیدا ڕێککەوتن Concord لەنێوان (بکەر و کار)دا هەیە ،ئەگەر بکەر (کۆ) بوو ،دەبێ (کار)ەکەش کۆ بێت، ئەگەر تاك بوو، ئەویش تاك دەبێت:

ـ کوڕەکە هات . کوڕەکان هاتن.

ـ کوڕەکە دێت . کوڕەکان دێن.

ئەمڕۆ لە زمانی (فەرەنسی) و (عەرەبی) ڕێکەوتن هەر تەنیا لەنێوان (بکەر و کار)دا نییە، بەڵکو لەنێوان ڕەگەزی تریش، وەك ئاوەڵناو و ئامرازی ناسین و نەناسین هەتا جێندەریش هەیە.

وێڕای پەیوەندی ڕێکەوت لەنێوان ڕەگەزەکانی ڕستە، ئەوە دوو پەیوەندی تر لەنێوان ئەو ڕەگەزانەدا هەن:

**یەکەم: پەیوەندی پارادیگماتیکی (ستوونی)**

لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێ ژمارەیەکی بێ کۆتا ڕستە دروست بکرێت:

ـ ئازاد خێرا هاتەوە.

ـ سەردار هێواش ڕۆیشتەوە.

ـ نازدار جوان دەخوێنێتەوە.

ـ هێڤی باش دەدوێ.

ـ نازێ بەتوندی گەڕایەوە.

**2ـ پەیوەندی سینتاگماتیکی (ئاسۆیی)**

ئەم جۆرە پەیوەندییە کە لەناو ڕەگەزەکانی یەك ڕستەدا ڕوو دەدات، لەسەر بنەمایەکی لۆژیکی دامەزراون:

* ئاسۆ ماسییەکی گرت و برژاندو خوارد.





هەر سێ کاری (گرتن، برژاندن، خواردن) دەبێت لەناو سیستەمی زمانی کوردیدا ئەوها بێن ،هەر شێوازێکی تر مەقبول نییە.

* ئاسۆ ماسیەکی خواردو برژاندو گرت.

* ئاسۆ ماسیەکی برژاندو گرت و خوارد.

* ماسیەکە ئاسۆی برژاندو گرت و خوارد.

یان

ـ ئازاد لەخەو ڕابوو، نوێژی کردو نانی خواردو چووە کۆلێژ.

ئەوانی تر لۆژیکی نین، بۆیە لەناو سیستەمی زمانی کوردی جێیان نابێتەوە.

* ئازاد نوێژی کردو لەخەو ڕابوو چووە کۆلێژو نانی خوارد!!

* ئازاد نانی خواردو لەخەو ڕابوو نوێژی کردو چووە کۆلێژ!! هتد.

7ـ پێکهاتەی زمان نەك ژمارەی ڕەگەزەکان

هەر زمانێك سترەکچەرێکی هەیە، مەعریفەی مرۆڤیش سەبارەت بەو سترەکچەرەوە پەیوەست نییە بە ئاستی بەرزی و نزمی مەعریفییەوە، ئەم زانینەی مرۆڤ واتای ئەوە ناگەیەنێت، کە مرۆڤ دەربارەی زمانەکەی هەڵە ناکات، چونکە هەر شتێك لە ئەبستراکت دەرباز بوو و ئیشی پێکرا ، ئەوە هەڵەی تێدەکەوێت.

کردارە زمانییەکان بە سترەکچەری زمانەوە بەندن نەك ژمارەی ڕەگەزەکانی ڕستە، چونکە ژماردنی ڕەگەزەکان هیچ پەیوەندی بە سروشتی زمانەوە نییە.

ناکرێ لەخۆوە بوترێ نیشانەی ناسراوی (ـ ەکە) بۆ یەکەم، دووەم، سێیەم، ڕەگەز ل ەڕستە زیاد بکە، هەروەها بەهەمان شێوە ناکرێ هیچ نیشانەیەکی تر وەك (دە ـ بەردەوام) یا (ن ـ کۆ) لەسەر ئەم بنەمایە زیاد بکرێت، چونکە هەردەم ڕێك ناکەوێ وشەی یەکەم (بکەر) ،هەردەم وشەیەکی تاك بێ، لەوانەیە گرێیەك یان

دەستەواژەیەك بێت، جا چۆن نیشانەی نەناسراوی لەسەر بنەمای ژماردن بۆ زیاد دەکرێ:

1ـ دوێنێ، کوڕ، درەنگ، هاتەوە.

ـ کوڕەکە دوێنێ درەنگ هاتەوە.

ـ دوێنێ کوڕەکە درەنگ هاتەوە.

* دوێنێکە کوڕ درەنگ هاتەوە.

2ـ کوڕە زیرەك و ئازایەکە لەشەڕدا کوژرا.

* کوڕەکە زیرەك ئازا لەشەڕدا کوژرا.

* کوڕە زیرەکە ئازا لەشەڕدا کوژرا.

ئەمەو زمانی مرۆڤ هەردوو جۆری لێڵی لێکسیکی و پێکهاتەیی دروست دەکات، وا دەکات کێشەیەك لە گەیاندنی "پەیام" لەنێوان (قسەکەر) و (گوێگر) یاخود (بیسەر) دروست ببێت. ئەم دیاردە زمانەوانییە و چەندەهای تر وەك (کرتاندن) و (لەبریتیدانان) لە زمانی مرۆڤدا هەیە. ئەم دیاردە زمانەوانیانە لە زمانی گیانەوەراندا نییە، زمانی ئاژەڵان ئەوەندە وەك زمانی مرۆڤ ئاڵۆز نییە، هەر بۆیە ئەوان لەهەر (پەیوەندییەك) دەتوانن (یەك پەیام) بگەیەنن ، نەك چەند پەیامێك.

## مرۆڤ لە زمانی ئاژەڵان دەگات یان ئەوان لە زمانی مرۆڤ دەگەن

بێگومان ئاژەڵانی هاوجۆرو پۆل لەیەك دەگەن، بەزمانی خۆیان لەگەڵ یەکتر دەدوێن، ئەوەتە مێرووەکان یەکتر ئاگادار دەکەنەوە لە سوپاکەی سلێمان پێغەمبەر، هەروەها لەچیرۆکی زمانی ئاژەڵانیش دەردەکەوێ کە گیانەوەران لەگەڵ یەکتر دەدوێن، بەڵام هیچ جۆرە پەیوەندییەکی هاوسەرگیری لەنێوان دوو پۆل یان دوو جۆری ئاژەل ڕووینەداوە.





ئەمەو هەر بەگوێرەی قورئانەوە سلێمان پێغەمبەر لەگەڵ هەموو گیانەوەران قسەی کردووە ، بەتایبەتی لەگەڵ (هدهد ـ پەپو سلێمانی)، ئەمە لە دنیایەك ڕوویداوە ، تایبەت بەهەموو مرۆڤەوە نەبووە، بۆیە تەنها کەسێك کە ئەو توانایەی هەبووبێ ، لەهەردوو جیهانی، جیهانی مرۆڤ و جیهانی گیانەوەران، بژیت، سلێمان پێغەمبەر بووە، بەواتای مرۆڤ و گیانەوەران هەردووك خاوەن زمانن، بەڵام ئەوکاتە مرۆڤ تەواو لەزمانی گیانەوەران دەگات کە پەردەی هەردوو جیهان ببڕێت ، ئەمەش ناکرێ !

ئەوەی لەجیهانی مرۆڤ ڕوو دەدات ئەوەیە:

هێماو نیشانەکانی زمانی ئاژەڵان زۆر کەمن، ناتوانن بەتەواوی وێنای ئەو پەیامە بکەن، کە بە زمان لەگەڵ مرۆڤ بدوێن، هەرچی هەندێ ئاژەڵی ماڵین لە هەندێ وشەی مرۆڤ دەگەن ،بە خۆشی بێ یان ناخۆشی ، پەیامەکەی مرۆڤ وەردەگرن و جێ بەجێی دەکەن.

هەموو گوێدرێژێك لەفەرمانی (وۆش) و (ئەچە) دەگات، هەموو پشیلەیەك لە (ختە)ی مرۆڤ ڕادەکات و لە (میاو میاو)و(پش پش) نیگەرانە، دوو دڵە تەواو نازانێ بۆ (خۆشی)یە یان (ناخۆشی)، هەروەها ئەگەر سەگێك و کەرێك و چەند بزنێك لە شوێنێك پێکەوەبن، ئەگەر شوانەکە (گدی گدی) بکات، ئەوە (بزنەکان) دێن ،بەڵام ئەگەر (کوچە کوچ) بکات ، (سەگەکە) دێت ، ئەگەر (قرۆش قرۆش) بکات، (کەرەکە) دێت ،بەپێچەوانە ڕوونادات ، (بە گدی گدی) سەگەکە یاخود کەرەکە نایەت!! هەروەها هەموو مریشکێکیش (کش کش) و (تی تی) لەیەك جیا دەکاتەوە، لەمەدا دەردەکەوێ کە ئەو پەیامە سنوردارانەی مرۆڤ هیچ لێڵییەك لای ئەو گیانەوەرانە دروست ناکەن، چونکە سادەن و هەروەها چەند بارەن، ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر جۆرەکانی مەیمونی شیمپانزی و دۆلفین و توتی... هتد کراون، لەسنووری زمانی هێما دەرناچن، ئەمەش لەوانەیە هەر لەبەر ئەو ڕاستییە

سادەیە بێت ، کە پێکهاتەی عەقڵی ئەوان لەگەڵ مرۆڤ جودایە، ئەوان دەتوانن لەگەڵ یەك بدوێن (وەك چۆن مێرووەکان لەگەڵ یەکتر دەدوێن)، بەڵام نـاتوانن لەگـەڵ مـرۆڤ بدوێن وەك مرۆڤیش ناتوانێ (بەزمانی ئەوان) لەگەڵ ئەوان بدوێت !

خالێکی تر ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ (لاڵ) یاخود (کەڕ) بێت ، هێشتا قەناتێکی تری مـاوە لە مرۆڤی ساخلەم بگات ، ئەویش (زمانی نووسینە)، ئـەم قەناتـەش لـە گیانـەوەردا ئەگەر مەحاڵ نەبێ ،ئەوە هەر زۆر دەگمەن و دژوارە.

## خێزانە زمانەکانی جیهان

زمانناسان، زمانەکانی جیهانیان بەسەر چوار خێزانە زمان دابـەش کـردوون، کـە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**یەکەم: خێزانە زمانی هیندۆ ـ ئەورووپی**

ئەم خێزانە لە کۆمـەڵێکی گـەورە پێکـدێت ،کـە لـە ڕەگـەز و بنـچینەدا نـزیکن لـە یەکترییەوە و ئەو گەلانەی دەگرێتەوە کە بەم زمانان دەدوێن و دەکەونە ناوەڕاستی ئاسیا هەتا ئەوپەڕی کەناری ڕۆژئاوای ئەورووپاوە.

أ ـ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی: بـە هێنـدۆ ـ ئـاری ناسـراوە، بەهۆیـەوە زمانـەکانی میتـانی و سانـسکریتی و مـاد و ئـەخمینی دەگرێتـەوە، کـە ئـەویش بەسـەر دوو لـق دابـەش دەکرێت:

1ـ کۆمەڵی هیندی: کە لە زمانەکانی (بنجانی، کۆجراتی، بـەهاری، بـەنگالی، هینـدی ڕۆژئاوایی، هیندی ڕۆژهەڵاتی، باراکراتی، راجاسانی) پێکدێت.

2ـ کۆمەڵی ئێرانی: کە لەزمانەکانی (فارسی کۆن، فارسـی نـوێ، کـوردی، ئـەفغانی، بلووجی، ئۆزەتی) پێکدێت.

ب ـ کۆمەڵی ڕۆژئاوایی: ئەم کۆمەڵەیە پێکدێت لە:





1ــ زمانـە جەرمەنییـەکان: (ئـەلمانی، ئینگلیـزی، دانیمـارکی، هۆڵەنـدی، زمانـە ئەسکەندەنافییەکان).

2ـ زمانە سلاڤییەکان: (ڕووسی، پۆڵەندی، چیکی، سلۆڤاکی، یۆگسلاڤی).

3ـ زمانی لاتینیەکان یان ڕۆمانییەکان: (ئیتالی، فەرەنسی، ئیسپانی، پورتوگالی).

4ـ زمانی یۆنانی: (ئەرمەنی، ئەلبانی).

5ـ زمانی کەلتی: (ئێرلەندی)

**دووەم: خێزانە زمانی سامی**

ئـەم خێزانـە، زمـانی ئـەو نەتەوانـە دەگرێتـەوە، کـە لـە وڵاتـی میزۆپۆتامیـا و دوورگەی عەرەبی و ژووروی ئەفریقیادا دانیشتوون. زانایان زاراوەی (سامی)یـان لـە ناوی (سام کوڕی نـوح)ەوە وەرگرتـووە، کـە لـە (تـەورات) یـشدا هـەر ئـەو نەتەوانـە دراونەتە پاڵ ئـەم نـاوە ، کـە بـەم زمانـە دواون، ئـەم خێزانـە زمانـەش لـەم کۆمەڵـە زمانانەی خوارەوە پێکدێت:

1ـ کۆمەڵەی باشوورییەکان: گرنگترینیـان: عـەرەبی کـۆنی خـواروو و شـێوە دێرینـە لەناوچووەکانی وەکو (سەبەئی، حیبری، قتبانی،سموودی)، عەرەبی نـوێی بـاکوور و زمانی حەبەشی دەگرێتەوە.

2ـ کۆمەڵەی باکوورییەکان: بریتییە لە ئارامی کۆن و سریانی و سابئە.

3ـ کۆمەڵی ڕۆژئاوایی یا کەنعانی، کە بریتین لە فینیقی و عیبری.

4ـ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی: بریتییە لە ئەکەدی، بابلی، ئاشووری.

**سێیەم: خێزانە زمانی ئۆراڵی**

ئەم خێزانە زمانە، دوو کۆمەڵە دەگرێتەخۆ:

1ـ ئۆراڵی: کە زمانی فنلندی و ئەستۆنی و مەجەری دەگرێتەوە.

2ـ ئەڵتیکی: کە زمانی تورکی، مەگۆلی، تەنوکوسی و مەنانشۆ دەگرێتەوە.

**چوارەم: خێزانە زمانی چینی تێبتی**

ئەم خێزانە زمانە، زمانەکانی (چینی، تایلەندی، بورمایی، تێبتی) دەگرێتەوە.

## چەمك و تاریفی دیالێکت

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی دیالێکت، ئەوا زاراوەکانی (زار، لەهجە، شێوە) بەکاردێت، زاراوەی دیالێکتیش لەبنچینەدا زاراوەیەکی لاتینییە، مەبەست لە دیالێکتیش بەو جیاوازییانە دەوترێت، کە لەنێوان جۆرەکانی یەك زماندا هەیە، وەك جیاوازیی ڕێزمان و لایەنی پێکهاتەی وشە و چۆنیەتی دەربڕین.

## جۆرەکانی دیالێکت

لە هەموو زمانانی جیهان لەپاڵ دیالێکتی سەرەکی و بەشە دیالێکتەکان، ئەوا کۆمەڵێ دیالێکتی تریش دەبینرێ، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

1ـ دیالێکتە کۆمەڵایەتییەکان: ئەم جۆرە دیالێکتە پەیوەندی بە ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندن و لایەنی نەتەوەییەوە هەیە، واتە بەگوێرەی بەرزی ئاستی ڕۆشنبیری کەسێك لەگەڵ کەسانی تر جیاوازی لەنێوان ئاخاوتنیان دەبێت.

**2ـ دیالێکتە پیشەییەکان:** هەر پیشەیەك خاوەنی شێوازی ئاخاوتنی خۆیەتی، کە بەهۆیەوە، لەگەڵ ئاخاوتنی پیشەکانی تر جیا دەکرێنەوە، بۆ نموونە: ((پزیشك، فیتەر، ئەندازیار، مامۆستا، کرێکار،...هتد)). هەریەکەیان کۆمەڵێ وشەو زاراوە بەکاردەهێنن، کە تایبەتە بە ئاخاوتنی خۆیانەوە، بۆ نموونە گەر ئاخاوتنی پیشەیی زێڕینگەری وەرگرین، دەبینین وشەکانی (عەیار، مسقال، عەبە،... هتد) بەرچاومان دەکەوێت.وەکو:

**زێڕ مسقاڵی بە چەندە.**





**زێڕی عەیار بیست و یەك بکڕە.**

لەهەمان کاتیشدا گەر پیشەی مامۆستایی وەرگرین، دەبینین دەیەها وشەی تر بەرچاومان دەکەوێت و بەکاردێت، کە جیایە لەگەڵ پیشەکانی تر، وەکو (تەباشیر، ڕەحلە، ماجیك... هتد).وەکو:

**بە تەباشیر وێنەکە بکێشە.**

**ڕەحلەکەی خۆت ببە دواوە.**

**3ـ دیالێکتە ناوچەییەکان:** هەر ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی تر، شێوازی ئاخاوتنی جیایە، بەجۆرێك هەندێ وشەو زاراوە لەناوچەیەکی دیاریکراو بەکاردێ، بەبێ ئەوەی لە ناوچەکانی تر بەکاربێت.

**4ـ دیالێکتی پەتی:** بەو دیالێکتە دەوترێ کە دەبێتە شێوەیەکی فەرمی، بەهۆیەوە نووسین و خوێندن بەمجۆرە دیالێکتە دەبێت ، هەر بۆیەشە هەندێ جار بەم دیالێکتە دەوترێ دیالێکتی فەرمی.

**5ـ دیالێکتی ڕەمەکی:** بەو قسەو ئاخاوتنانە دەوترێت، کە لەسەر شەقام و کۆڵانەکان و گازینۆ و بازاڕو چایەخانەکان بەکاردێت، ئەمجۆرەیان لە ئاخاوتندا شێوەیەکی ڕەمەکی پێوە دیارە ، بەواتایەکی تر ئەمجۆرەیان لەهەموو جۆرەکانی تری دیالێکت نزمترە.

جگە لەم جۆرە دیالێکتانەی کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، ئەوا لە زمانناسی نوێدا جۆرەکانی دیالێکت بەسەر چوار جۆر دابەشدەکرێن، کە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**1ـ دیالێکتی ستاندارد**

**2ـ دیالێکتی ڕەگەزی**

**3ـ دیالێکتی جوگرافیایی**

## 4- دیالێکتی چینە کۆمەڵایەتییەکان

گەر زمانی کوردی لە ڕوانگەی ئەمجۆرە دابەشکردنەی دیالێکتەوە دابەشبکەین، دەبینین دیالێکتەکانی زمانی هەموو سەر بەدیالێکتی جوگرافیاین، چونکە کرۆکی هۆی بوونیان، پەیوەندی بەدەستکردی هەلومەرجی جوگرافیایی و سیاسییەوە هەیە.

## هۆکارەکانی پەیدابوونی دیالێکت

1- هۆکاری کۆمەڵایەتی: ئەم هۆکارە پەیوەندی بە عادات و تەقالیدو خووڕەوشتی ناو کۆمەڵگەو دابەشبوونی چینەکانی کۆمەڵگاوە هەیە.

2- هۆکاری سیاسی: دوو لایەن دەگرێتەوە:

أ ـ هۆکارێکیان ئەوەیە، کە میللەتێك خاوەنی حکومەتێکی ناوەندی نەبێت.

ب ـ هۆکاری دووەمیان ئەوەیە کە حکومەتی ناوەندی بوونی هەیە، بەڵام لەبەر فراوانی سنووری دەسەڵاتەکەی، ناتوانێت دەسەڵاتی بەسەر هەموو ناوچەکاندا بکێشێت، بۆیە دەسەڵاتی ناوەندی لاواز دەبێت، بۆیە بەهۆیەوە وادەکات کە هەر شوێن و ناوچەیەك ببێتە خاوەنی شێوە ئاخاوتنێکی تایبەتەوە.

3- هۆکاری جوگرافیایی و سروشتی هەڵکەوتوویی ناوچەکە.

4- ڕادەی ڕۆشنبیری و دواکەوتووی کۆمەڵگەکە.

5- جیاوازی لەڕووی لایەنی دەنگسازییەوە بۆ نموونە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا (نووسی) بەکاردێ، بەڵام لەکرمانجی سەرووی زمانی کوردییە (نڤیسی) بەکاردێ.

6- لایەنی ئابووری، کە ئەمەش پەیوەستە بە چوونیەتی دابەش نەبوونی ئابووری لە شوێنە جیاوازەکاندا.





7- هۆکاری بایۆلۆجی و فیزیکی، کە ئەمەش پەیوەستە بە کردەی دروستبوونی مرۆڤەوە.

## جیاوازی نێوان زمان و دیالێکت

1ـ زمان لایەنێکی گشت و سنوورێکی جوگرافی فراوان دەگرێتەوە، بەهۆیەوە بەهەموو لایەکی وڵاتدا پەڵدەکێشێ، تا ڕادەیەکیش هەموو دیالێکتەکان کۆدەکاتەوە، بەڵام دیالێکت ناوچەیەکی سنووری جوگرافی دیاریکراو دەگرێتەوە، واتە لایەنێکی تایبەتییە.

2ـ زمان کۆی هەموو ئەو جیاوازییانە دەگرێتەوە، کە لەنێوان دیالێکتەکانی زمانەکەدا هەن، بەڵام دیالێکت لەسەر بنەمای ئەو جیاوازییانە دروست دەبێت، کە لەناو زماندا هەیە، بۆیە جیاوازییەکی زۆریان لەسەر ئەم ڕێککەوتنەدا هەیە.

3- زمان پەیوەستە بە بنەمای لەیەکتر گەیشتن، بەڵام دیالێکت پەیوەستە بە بنەمای لەیەکتر نەگەیشتن، واتە ئەگەر دوو زار لەیەکتر گەیشتن، ئەوا ئەو دوو زارە، زمانێك پێکدەهێنن، بەڵام ئەگەر زارەکان لەیەکتر نەگەیشتن، ئەوا هەریەك لەمانە بەرەو ئاراستەیەکی زمانی سەربەخۆ دەڕۆن.

4- بەشێوەیەکی گشتی زمان بۆ ئەم جۆرانە دابەش دەکرێت: (زمانی نووسراو، زمانی بینراو، زمانی جەستە، زمانی ڕەنگ، زمانی ڕووخسار، زمانی دەق، زمانی شیعری، زمانی ئاخاوتن، زمانی ئامێریی،...هتد)، بەڵام دیالێکت ئەم جۆرە دابەشکردنانەی نییە، بەڵکو دیالێکت ئەمجۆرانە دەگرێتەوە: ((دیالێکتی پەتی، دیالێکتی ستاندارد، دیالێکتی ناوچەیی، دیالێکتی فەرمی، دیالێکتی ڕەمەکی، دیالێکتی کۆمەڵایەتی...هتد).

5- زمان بەپێی ڕەگەزی ئەندامانی کۆمەڵ ناگۆڕێت، بەڵام دیالێکت بەپێی ڕەگەز و جوگرافیا و دابەشبوونی چینەکانی کۆمەڵگە دابەش دەبێ. دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە هەندێ جار باس لە زمانی ئافرەت و زمانی پیاو دەکرێ، بەڵام ئەمە خۆی لەخۆیدا پەیوەستە بە شێوازی کردەی ئاخاوتنەوە، واتە دەچێتە حاڵەتی دیالێکتەوە، نەوەك زمان.

## دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی

دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لای شارەزا و پسپۆڕانی کورد لە کۆنەوە تاکو بە ئەمڕۆ دەگات بە چەند شێواز و جۆری جیاجیاوە دابەشدەکرێت، بۆیە لێرەدا هەندێ لەو دابەشکردنانە دەخەینەڕوو:

- شەرەفخانی بەدلیسی لە کتێبی (شەرەفنامە)دا، بەم شێوەیەی خوارەوە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**1- کرمانج**

**2- لوڕ**

**3- کەلهوڕ**

**4- گۆران**

- محەمەد مەردۆخی لە کتێبی (مێژووی کورد و کوردستان)دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**1- کرمانج**

**2- گۆران**

**3- لوڕ**

**4- کەلهوڕ**





- محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبی (خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان)دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**1- کرمانجی ڕۆژهەڵات**

**2- کرمانجی ڕۆژئاوا**

**3- کرمانجی باشووری ڕۆژئاوا**

- شێخ محەمەدی خاڵ لە فەرهەنگی (خاڵ)دا، بەم شێوەیەی خوارەوە دیالێکتەکانی زمانی دابەشکردووە:

**1- زازا**

**2- کرمانجی دەستە چەپ (شمالیی): (بۆتانی، بادینانی، هەکاری، بایەزیدی، شەمدینانی).**

**3- کرمانجی دەستە ڕاست: (سۆرانی، بابانی، موکریانی، ئەردەلانی، کەلهوڕی، گۆران).**

**4- لوڕی (بەختیاری، لەکیی، فەیلی).**

- تۆفیق وەهبی لە کتێبی (ئەشکەوتەکەی گۆندۆك) و گۆڤاری (پەیام)دا، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**1- کرمانجی**

**أ - کرمانجی شیمالی: (بایەزیدی، بۆتانی، ئاشیتایی، هەکاری، بادینانی).**

**ب - کرمانجی جنوبی: (موکری، سۆرانی، سولەیمانی، سنەیی).**

**2- لووڕی: (بەختیاری، لەکی، فەیلی، کەلهوڕی، مامەسەنی).**

**3- گۆران: (باجەلانی، کاکەیی، زەنگەنە، هەورامی).**

**4ـ زازا.**

• د. فوئاد حەمە خورشید لە کتێبی (زمانی کوردی ـ دابەشبوونی جوگرافیای دیالێکتەکانی) بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**1ـ کرمانجی باکوور: (بایەزیدی، هەکاری، بۆتانی، شەمدینانی، بادینانی ، دیالێکتی ڕۆژئاوا).**

**2ـ کرمانجی ناوەڕاست: (موکری، سۆرانی، ئەردەلانی، سلێمانی، گەرمیانی).**

**3ـ کرمانجی باشوور (لوڕی ڕەسەن، بەختیاری، مامەسەنی، کۆهگلۆ، لەک، کەلهوڕ).**

**4ـ (گۆرانی ڕەسەن، هەورامانی، باجەلانی، زازا).**

• زوبێر بیلال لە کتێبی (مێژووی زمانی کوردی)دا، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**1ـ کۆمەڵی ژوورو (کرمانجی)**

**2ـ کۆمەڵی خواروو (سۆرانی)**

• جەمال نەبەز لە کتێبی (زمانی یەکگرتووی کوردی)دا، بەمشێوەیە دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابەشکردووە:

**أ ـ دوو شێوە بنچینەییەکە:**

**1ـ کرمانجی ژووروو: (بۆتانی، جزیرەیی، هەکاری، بادینانی ، ئاشیتەیی، بایەزیدی).**

**2ـ کرمانجی نێوەڕاست: (سلێمانی، سنەیی، ئەردەلانی، گەرمیانی، هەولێر، کەرکوکی، سۆرانی، موکری، شارباژێری، پشدەری).**

**ب ـ دوو شێوە لاتەنیشتەکە:**

**1ـ کرمانجی خواروو: (ژێروو): (فەیلی، کرماشانی، لەکی، کەلهوڕی، خانەقینی، لوڕی).**





**2ـ کۆمەڵە شێوەی گۆرانی ـ زازایی (گۆران، زازایی، هەورامانی).**

• د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە کتێبەکانی (زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی) و (بۆ زمان)دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**1ـ لوڕ**

**2ـ کرمانجی ژوور: (بۆتانی، هەکاری، بادینانی ، بایەزیدی، ئاشنایی).**

**3ـ گۆران: (هەورامی).**

**4ـ کرمانجی خواروو: (سۆرانی، سلێمانی، موکری، گەرمیانی).**

• تاهیر سادق لە کتێبی (ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی)دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە خستۆتەڕوو:

**1ـ زازا**

**2ـ لوڕی (بەختیاری، لەکیی، فەیلی، ڕۆژبەیانی).**

**3ـ کرمانجی**

**أ ـ کرمانجی سەروو: (بۆتانی، بادینانی ، هەکاری، بایەزیدی، شەمدینانی).**

**ب ـ کرمانجی خواروو: (سۆرانی، موکریانی، ئەردەلانی، کەلهوڕی، گۆران).**

• د. کەمال فوئاد لە وتاری (زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان)دا، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە خستۆتەڕوو:

**1ـ کرمانجی سەروو**

**2ـ کرمانجی خواروو**

**3ـ کوردی باشوور**

**4ـ گۆران و زازا**

• محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی (زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا)، دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەمشێوەیە دابەشکردووە:

**1ـ شێوەی کرمانجی سەروو یا ژووروو (بۆتانی، هەکاری، دیاربەکری، بادینانی ، ماردین،... هتد).**

**2ـ شێوەی کرمانجی ناوەڕاست: (سۆرانی، موکریانی، سلێمانی، کەرکووکی).**

**3ـ شێوەی کرمانجی خواروو: (هەورامان، لوڕی، باجەلانی، زازای).**





## سنوور و نەخشەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی

**یەکەم :دیالێکتی کرمانجی سەروو ( باکوور)**

ئەم دیالێکتە لە هەموو دیالێکتەکانی تری زمانی کوردی فراوانترەو زۆرترە، چونکە کوردەکانی کوردستانی تورکیا (پارێزگاکانی بایەزیدی، وان، جۆلە مێرگ، سیعرت، مووش، ماردین، دیاربەکر، خەرپوت، ئەدیابان، غازیان تەپە، بەشەکانی خۆرهەڵاتی پارێزگای مەرعەش و سیواس و بەشەکانی باشووری پارێزگای ئەرزەرۆم و قارس) ، هەموو بەم دیالێکتە دەدوێن، هەروەها کوردەکانی باشووری خۆرئاوای ئەرمەنستان، ڕووسیا و باکووری سوریا و دانیشتوانی پارێزگای دهۆك و قەزاکانی زێبار و ئامێدی و شێخان و سنجار و ئاکرێ لە کوردستانی عێراق بەم دیالێکتە دەدوێن.

ئەم دیالێکتە لقە دیالێکتەکانی بەمشێوەیەی خوارەوەن:

1ـ بایەزیدی: دەکەونە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی زەریاچەی وان.

2ـ هەکاری: دەکەونە باشوور و باشووری خۆرئاوای زەریاچەی وان.

3ـ بۆتانی: دەکەونە دەوروبەری دۆڵی بۆتان و شاری سیعرت و ئەرتوش و جزیرەو دیاربەکر (ئامەد).

4ـ شەمدینانی: گۆشەکەی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا و خۆرهەڵاتی زێی ژووروو و ناوچەکانی نزیك بەم زێیەیە لە ئێران.

5ـ بادینانی: پارێزگای دهۆك و قەزاکانی ئامێدی و زێبار و سنجار و شێخان و ئاکرێ دەگرێتەخۆ.

6ـ بەشە دیالێکتی خۆرئاوا: خەرپووت و ئۆرفەو عفرین و مەرعەش دەگرێتەوە.

## دووەم: دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست

ئەم دیالێکتە پێنج شێوەزاری ناوچەیی دەگرێتەخۆ:

1ـ موکری: مەڵبەندەکانی شنۆ، نەغەدە، مەراغە، میاندواو، شاهێن دژ، سەقز، بۆکان، بانە و سەردەشت دەگرێتەوە.

2ـ سۆرانی: قەزای زێباری لێ دەرچێ، هەموو پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە، شاری هەولێر ناوجەرگەی ئەم شێوەزارەیە.

3ـ ئەردەلانی: مەڵبەندەکانی سنە، بیجار، کەنگەوەر، ڕەوانسەر، باکووری ناوچەکانی جوانڕۆ لە کوردستانی ئێران، لە کوردستانی عێراقیش قەزای قەڵادزێ(پشدەر) دەگرێتەوە. شاری سنە ناوجەرگەی ئەم شێوەزارەیە.

4ـ سلێمانی: شاری سلێمانی ناوجەرگەیەتی، هەموو پارێزگاکە جگە لە قەزای قەڵادزێ (پشدەر) نەبێت دەگرێتەوە، هەروەها هەندێ ناوچەی قەزای خانەقینیش دەگرێتەوە.

5ـ گەرمیان: ئەم شێوەزارە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سلێمانی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەزارێك دادەنرێت، بەهۆیەوە هەموو ناوچەکانی کفری و قەرەتەپەو کەرکوك و دووزخورماتوو و شوان لە کوردستانی عێراق دەگرێتەوە.

## سێیەم: دیالێکتی کرمانجی باشوور ( خواروو )

ئەم دیالێکتە چەند شێوەزارێك دەگرێتەوە:

1ـ لەکی: ئەم شێوەزارە ، کوردەکانی (پێش کۆ)ی لوڕستانی پێ دەدوێن، تیرەکانیشی بریتین لە (خواجەوەند ، عەبدولمالیکی، ناداوەند، شۆجا، کاتاوەند، دەلفان، سەلسەلە، پیران وەند).





2ـ بەختیاری: بەختیاری دوو بەشن، (هەفت لنگ) ، واتا (حەوت هۆز)، کە لە ناوچەکانی ئاوەلێژی ڕووباری گارۆندا دەژین.(چوارلنگ)، واتا (چوار هۆز)، لە ناوچەی نێوان ڕووباری گارۆن و ڕووباری زالکیدا نیشتەجێن.

3ـ مامەسەنی: ناوی ئەم شێوەزارە لە (محەمەد حەسەن)ی باپیرە گەورە مامەسەنینانەوە وەرگیراوە، کە بریتین لە (بەکشی، جاوی، ڕوستەمی (خان عەلی خان، ئیمام قولی خان) دەگرێتەوە.

4ـ کۆهگلۆ: ئەم لقە لە باشووری ناوچەکانی بەختیارییەوە و لە دەوروبەری کێوی دنیاو چاوگەکانی ڕووباری چەراهی یەوە دەست پێ دەکات تا رامهورموز و بەهبەهان و کزەیرون، دوو کۆمەڵەن:

أ ـ کۆمەڵەی پشتی کۆ

ب ـ کۆمەڵەی ژێرکۆ

## 4ـ دیالێکتی گۆران

ئەم دیالێکتە لە باکووری ڕێگەی نێوان قەسری شیرین ـ کرمانشاهـ دەست پێ دەکات، بەرەو شاخەکانی هەورامان، هەروەها لەسەرچاوەکانی سیراوەنەوە بەرەو خۆرهەڵات دانیپۆشیوە تا کرماشان. ئەم دیالێکتە پێك دێت لە:

1– گۆرانی ڕەسەن: کە دانیشتوانی ناوچەکانی (کرند، زەهاو، جوانڕۆ) لە کوردستانی ئێران قسەی پێ دەکەن ، هەروەها لە کوردستانی عێراق، هەندێ کاکەیی داقوق و تیرەی زەنگەنەی نزیك کفری و قادرکەرەم و سیامەنسوری سەر بە ناوچەی لەیلان قسەی پێ دەکەن.

2ـ هەورامان: دانیشتوانەکانی شاخەکانی هەورامان و پاوە و پڵنگان دەگرێتەوە، هەورامیش دوو بەشن، بەشی لهۆنیان لە خۆرئاوای ڕیزە شاخەکانی هەورامان، واتە

دەکەوێتە کوردستانی عێراق، بەشی دووەمیان، هەورامانی (تەخت) کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاخەکانی هەورامان، واتە دەکەوێتە کوردستانی ئێران.

3ـ باجەلانی: ئەم شێوەزارە پەرش و بڵاون، هەندێکیان لە باکووری خۆرهەڵاتی شاری مووسڵ نیشتەجێن، کە پێیان دەوترێ (شەبەك)، بەشێکیشیان لە زەهاو و لە باکووری لوڕستان و نزیك خانەقین و قۆرەتوو هۆرین و شێخان.

4ـ زازا: ئەم لقە دیالێکتە ناوچەکەی دەکەوێتە کوردستانی باکوور، کە کەوتۆتە ناوچەی نێوان ئەرزەرۆم ـ موش ـ خەرپووت و ئەرزنجان دەگرێتەوە، کەواتە ئەمانە دەکەونە ناوچەی دەرسیمەوە.

## زمانی ستاندەر

پێش ئەوەی باسی زمانی ستاندەر بکەین، وا چاکە چەند زاراوەیەك لەیەکتر جیا بکەینەوە ، کە زۆرجار تێکەڵی یەکتر دەکرێن، زمانی یەکگرتوو، زمانی نەتەوە، زمانی نیشتمانیی، زمانی فەرمی، زمانی ستاندەر. ئەوانە زۆرجار بە هاوواتای یەکتر دادەنرێت، بەڵام ئەمە هەموو کاتێ لە هەموو شوێنێ ڕاست نییە.

چەمکی زمانی یەکگرتوو لەناو کورددا لەڕێگەی زمانی ئەدەبەوە لەناو کورددا بڵاوبۆتەوە، بەتایبەتی لە (خوێندن) و (کارکردن) لەسەر ئەدەبی قوتابخانەی بابان (نالی، سالم، کوردی)، ئەو جۆرە زمانە (زمانی ئەدەب پێنووسین) هێندە گرنگی پێدرا، بەجۆرێ شاعیرانی دەڤەری تری کوردستانیش بەو زمانە ، شیعریان نووسیوە.

لەلایەکی تر، زمانی یەکگرتوو، زمانی نەتەوە، زمانی دایکیش دەگەیەنێ، زمانی ناسنامەی نەتەوەیی کوردە، بەو زمانە (کورد) لە (فارس) جیا دەکرێتەوە.





چەمکی زمانی نەتەوە لەگەڵ ڕێنسیانسی ئەوروپی لە ئەوروپا بڵاوبۆوە، بەڵام لەناو کورددا ئەو زمانە بەر لە ڕێنیسانسی ئەوروپی لەلای شاعیرێکی وەك (ئەحمەدی خانی) نەك هەر ئەدەبی پێ نووسرا، بەڵکو وەك چەمکێکی نەتەوەیی کاری لەسەر کراوە.

ئەحمەدی خانی بە زمانی نەتەوەکەی داستانێکی نەتەوەیی نووسیوە، بۆ ئەوەی میرانی کورد و تاکەکانی نەتەوەکەی لە هەڕەشەی گەلانی هاوسێی کورد وشیار بکاتەوە. زمانی کوردی لە لای ئەحمەدی خانی زمان و ناسنامەی نەتەوەیی کوردە، ئەو ڕەوتە (داکۆکیکردن لەسەر زمانی نەتەوە) لەلای (حاجی قادری کۆیی) زیاتر پەرەی پێدرا ، بەجۆرێ ئەو زمانە بە شەرەفی کۆمەڵایەتی سیاسی نەتەوەش داندرا. زمانی نیشتمانیی لە کۆمەڵگای تاکزمانی و تاك نەتەوە، واتایەکی هەیە ، زۆر جودایە لەو واتایەی لە وڵاتێکی فرەنەتەوە هەیەتی.

زمانی نیشتمانی، زمانی نەتەوە و فەرمی ئینگلیز و فەرەنسی و ئەڵمانییە لە وڵاتی خۆیاندا، چونکە لەو وڵاتانەدا ئەو سێ زمانە (زمانی نەتەوە، زمانی نیشتمانیی و زمانی فەرمی وڵات) هاوواتای یەکترن، بەڵام ئەو وڵاتانەی فرە زمان و فرە نەتەوەن ، وەك (بەلجیکا و سویسرا) لە ئەوروپا ، (سەنگافورەو چین) لە ئاسیا، (گانە) لە ئەفریقیا ،ئەو دووە هاوواتای یەکتر نین، لە وڵاتانی وەك عێراق، تورکیا، ئێران، سوریا (کە سەبارەت بە کورد وڵاتی داگیرکارن) ، زمانی نەتەوەی باڵادەست لەو وڵاتانە بە زمانی فەرمی، نیشتمانیی هەتا ستاندەر دادەنرێن.

زمانی فەرمی ئەو زمانەیە لە بواری دادگا، دامودەزگای دەوڵەت، هەروەها ڕاگەیاندن بەکاردێت.

وڵات هەیە تەنها یەك زمانی فەرمی هەیە، وڵاتی تریش هەیە کە چەند نەتەوەیەکی جیاوازی تێدا دەژی ، ئەوە زیاتر لە زمانێکی فەرمی هەیە، وڵاتێکی

وەك هیندستانیش بەبێ هەبوونی نەتەوەیەکی وەك ئینگلیز لە وڵاتەکەیاندا ، زمانی ئینگلیزی هاوشانی زمانی هیندی ، زمانێکی فەرمییە ! ! شیانی زمانی ئینگلیزی لەبواری تەکنەلۆژیای سەردەم و هەژموونی سیاسی ، هەروەها ڕەوشی سیاسی و ئەتنیکی و مەزهەبی هیندستان وایکرد زمانی ئینگلیزیش ببێتە زمانێکی فەرمی ، ئەگەرنا نەدەبوو هیندییەکان ئەمە قەبوڵ بکەن، چونکە ئینگلیز ماوەیەکی زۆر داگیرکاری هیند بووە.

زمانی ستاندەر، زمانی خوێندنە، زمانی دایك نییە، زمانی ئاخاوتن نییە، زمانی نووسینە، ئەو نەتەوەیەی ناسنامەی نەتەوەیی لە هەڕەشە دابێ ، تەنیا بە زمانی ستاندەر دەتوانێ بەرگری لە مانەوەی خۆی بکات، زمانی پەروەردە و فێرکردن زمانی بونیادنانەوەی نەتەوەیە، وڵاتێکی وەك (ژاپۆن) و (ئەلمانیا) لەجەنگی جیهانی دووەمدا، بەهۆی سیاسەتی پڕ هەڵە و شەرمەزاری سەرکردەکانیان، خەریك بوو لەناو بچن، بەڵام بە زمانی خوێندن، توانیان جارێکی تر ببنەوە دوو وڵاتی زلهێزی ئابووری بەهێز و خاوەن تەکنەلۆژیای سەردەم.

عەرەبەکانی جەزائیرو تونس و مەغریب ، بوودجەی گەورەیان داناوە لەپێناو لاوازکردنی هەژموونی زمانی فەرەنسی لە وڵاتدا ، هەروەها گەڕانەوەی هەیبەتی زمانی عەرەبی لەخوێندندا.

بۆ کوردیش، زمانی ستاندەر، ئاسایشی نەتەوەیی و پاراستنی تاکەکانیەتی!

### زمانی ستاندەر چۆن دروست دەبێت

دەکرێت چەمکی "زمانی ستاندەر" لە بەرانبەر زمانێکی دی ستاندەر، یان ناستاندەر بەکاربێت ، ئەم دیاردەیە زیاتر لەنێوان دوو زمان، دوو نەتەوە یان دوو کەلتوور بەکاربێت، بەڵام هیچ زمانێك لەسەر ئاستی نەتەوە زمانی ستاندەر نییە ! زمانی نەتەوە هەموو ستاندەر نییە، بەڵکو ئەوە زارێکە یان بنزارێکە دەبێتە





ستاندەر و زمانی نەتەوە لەبەرانبەر نەتەوەیەکی تر دەنوێنێ ، بەواتای زمانی عەرەبی ستاندەرە بەرانبەر زمانی فارسی نەك هەردوو لەسەر ئاستی نەتەوە ستاندەربن!

ستاندەربوونی زارێکی زمانێك بەدوو ڕێگە ڕوودەدات: ڕێگەی کلاسیکی، ڕێگەی پلانی زمان.

### * ڕێگەی کلاسیکی

ئەم ڕێگەیە بەچەند شێوازێك ڕوودەدات:

**یەکەم: زمانی کتێبێکی ئاسمانیی ، وەك قورئانی پیرۆز**

**دووەم: هەژموونی سیاسی زارێك**

**سێیەم: دەسەڵاتی سیاسی وڵات**

**چوارەم: ئەکادیمیای زمان یان ئەکادیمیای زانستی زمان**

**پێنجەم: دەستەی ڕۆشنبیرانی وڵات**

لەم هەموو شێوازانەدا جۆرێك لە (سەپاندن) هەیە ، جا ئەو سەپاندنە مەعنەوی و خۆهێشتی بێت یان سەپاندنی زۆرەملێی، هەرچەندە ئەوەی یەکەم سروشتی ترە، بەڵام ئەوەی دووەم بەربڵاوترە، نموونەی سەپاندنی زمان و ئەلفبێی لاتینی لە ئەوروپا نەك هەر بەسەر نەتەوەیەك ، بەڵکو چەند نەتەوەیەکی جودا مێژوویێکی دوور و درێژی لە ئەوروپا هەیە، هەروەها زۆربەی وڵاتە تۆتالیتارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیا پەیڕەوی لاتینییەکانیان کرد، دیارترین نموونەی ئەزموونی یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی عەرەبی و تورکیاو ئێران.

## * ڕێگەی پلانی زمان

پلانی زمان یاخود ئەندازەی زمان ، هەوڵێکی ورد و سیستیماتیکی و لەسەر تیۆر دامەزراوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی پەیوەندیکردنی کۆمەڵگایەکی (فرەزمانی) یاخود (تاکزمانی). ئەو سیاسەتەی زمان هەوڵ دەدات لەناو هەموو دیالێکتەکانی زمانێك (کۆمەڵگای تاکزمانی) یان زمانەکانی کۆمەڵگایەکی فرەزمان ، زارێك بۆ تاکەکانی نەتەوەیەك بکاتە زمانی ستاندەر یان زمانی فەرمی وڵات. لەناو کۆمەڵگای فرەنەتەوەش زمانێك هەڵدەبژێرێ کە ببێتە زمانی فەرمی وڵات.

پلانی زمانیش بۆ پرۆسەی بە ستاندەربوونی زارێك لە کۆمەڵگای کوردی تاکزماندا ، بەو چەند قۆناغانەی خوارەوە دەبێت:

**یەکەم: هەڵبژاردنی زارێك یان بنزارێك**

**دووەم: بەسیستەمکردن**

**سێیەم: بەهەمەلایەنکردن**

**چوارەم: جێبەجێکردن**

**پێنجەم: قەبوڵکردنی جەماوەریی**

### یەکەم: هەڵبژاردنی زارێك یان بنزارێك

پایەی زارێك، چ لەلایەنی کۆمەڵایەتی، هەژموونی ئایینی یاخود سیاسی، زۆر گرنگە لە پرۆسەی هەڵبژاردن و دیارکردنی زارێك لەنێو زارەکانی زمانێك ، بێگومان ئەم هەڵبژاردنە ڕەمەکی نابێ ، بەڵکو دەبێت کەسانی زمانەوان و پسپۆڕ لەبواری زمانەوە ئەنجامی بدەن.

هەرچەندە ئەم پرۆسەیە زمانەوانییە، بەڵام زۆرجار دەسەڵاتی سیاسی ڕۆڵی خۆی دەبینێ لەسەپاندنی زارێك بەسەر زارەکانی تردا، ئەوەتە لە ئیسرائیل، هەرچەندە زمانی عیبری زمانی زۆربەی خەڵکی ئیسرائیل نییە، بەڵام دەسەڵات و حکومەتی





ئایینی ئیسرائیلی کردوویەتی بە زمانی فەرمی حکومەت و خوێندن، لە فلیپینیش لەسەر دیارکردنی زمانی فەرمی حکومەت چەندەها شەڕی زمانی نیشتمانیی بەرپابوو، بۆیە گرنگە لە هەڵبژاردنی هەر زارێك لەزارەکانی زمانی کوردیدا ، ئەوپەڕی لۆژیك بەکاربێت، چونکە ماوەیەکە "شۆڤێنیزمی زار" بەرچاوی بەشێك لە زمانەوانانیشی لێڵ کردووە !

خاڵێکی تری گرنگ لێرە ئەوەیە، دەبێ تەنها (زارێك) و تەنها (ئەلفبێیەك) هەڵبژێردرێ، چونکە جگە لەمە ئەو بەشەی کوردستانیش جارێکی تر تووشی دابەشکردن و داگیرکردن و زیندووکردنەوەی کەلتووری میرو مێنتالیتی خێڵ و عەشیرەت دەبێتەوە.

### دووەم: بەسیستەمکردن

لێرە یەکخستنی ڕێزمان و فەرهەنگی نەتەوە و ڕێنووس هۆکاری گرنگن بۆ دامەزراندنی زاری ستاندەر ، بێگومان ڕێزمان و فەرهەنگ و ڕێنووسێکی یەکگرتوو ، کۆکردنەوەیەکی ڕۆحی قوتابی و خوێنەواری کوردی لێدەکەوێتەوە، بەمەش تاکەکانی نەتەوە هەست بە یەکێتیەکی نەتەوەیی بەهێز دەکەن، دروستبوونی ئەو یەکێتیەش ناوەندێکی ستراتیژی دەبێت بۆ پاراستنی ئاسایشی زمان.

### سێیەم: هەمەلایەنی زاری ستاندەر

زاری هەڵبژێردراو بۆ ئەوەی ببێتە زاری ستاندەرو فەرمیی وڵات ، دەبێت لەهەموو لایەکەوە توێژینەوەی لەسەر بکرێت و پەرەی پێبدرێت، هەبوونی چەند دەقێکی ئەدەبیش بەو زارە ستاندەرە، کە کاریگەری ناوچەیی لەسەرەوە نەبێت، هۆکارێکی ترە بۆ بەرەوپێشچوونی پرۆسەی بەستاندەربوونەوە. زمانی ئەم دەقە

دەبێ ئەدگاری زمانی باڵای هەبێ، لە زمانی ئاخاوتن و زمانی ڕۆژانەی ناوچەیەك دوور بێت!

## چوارەم: جێبەجێکردن

پاش ئەوەی زارێك لەزارەکان هەڵبژێردراو بنەماکانی بەستاندەرکردنی بۆ داڕێژراو لەهەموو لایەکەوە بەرەو زمانێکی باڵا بردرا، کە نوێنەری هەموو نەتەوە بێت نەك ناوچەیەك، ڕۆڵی حکومەت دەست پێدەکات لەجێبەجێکردنی ئەم پرۆژە نەتەوەیی و نیشتمانییە، دەبێت حکومەت لە دامودەزگای خۆی بەتایبەتی هەر سێ وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵاو ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن خەڵك هانبدات ئەو شێوە زمانە بەکاربێنن و بە زمانی خۆیان بزانن. حکومەتی هەرێمی کوردستان "بەهێمنی!" دوور لە ڕاگەیاندن کار لەسەر بە فەرمی ناساندنی زاری کرمانجی ناوەڕاست دەکات، بەڵام ئەفسوس وەزارەتی پەروەردە خەریکە "بە ئاشکرا" زمانەکە لە خوێندن "کەرت" دەکات، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی بەو کارە نەتەوەیەکی بەش بەش بوو لەڕووی سیاسەت، جوگرافی و ئایدیۆلۆژیاوە جارێکی تر لەڕووی زمانەوەش، ئەوەی داگیرکار پێی نەکرا، ئەو وەك "کارێکی پەروەردەیی" بەش بەش تری دەکات!

## پێنجەم: پەسەندکردنی جەماوەریی

لە دەستووری هەرێم، بەندێك هەیە بۆ ڕاپرسی لەسەر شتە چارەنووسسازەکانی نەتەوە، دیارکردنی زمانی خوێندنیش نەك هەر پرسێکی چارەنووسسازە، بەڵکو پرسی پاراستنی نەتەوەو زمانی نەتەوەیە! لەم ڕوانگەوە دەبێت پەرلەمانی کوردستان پرسی هەڵبژاردنی زاری ستاندەری کوردی بداتە دەست خەڵکی خۆی، جا





ئەگەر زۆربەی خەڵك پەسەندی ئەو زارەی کرد ، وەك زارێکی ستاندەر بۆ خوێندن ،هەروەها هەستێکی نەتەوەییان لەلا دروست بوو بەوەی ئەو زارە هەر زاری خوێندن نییە، بەڵکو زمانی نیشتمانیشە ، پرۆسەکە تەواو دەبێ و کورد لە قەیرانی نەبوونی زمانی ستاندەر ڕزگاری دەبێت.

## ئەلفبێ

ئەلفبێ چەند پێناسەك لەخۆ دەگرێ، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەلفبێ سیستەمی نووسینی زمانە، دەکرێ بڵێین: ئەلفبێ کۆمەڵێك پیتی ستاندەر یاخود کۆمەڵێك هێمای (نووسراوی) سەرەکین ، هەریەکەیان (نزیکەی) فۆنیمێك (نەك دەنگێك) لەزمانی ئاخاوتنی گەلێك دەنوێنێ.

لەم پێناسەیەدا، چەند چەمکێك هەن پێویستە ڕوون بکرێنەوە. پیتی ستاندەر ئەو پیتانەن کە لەزمانێکدا دانیان پێدانراوەو نووسینیان پێ دەکرێت و هەموو خوێندەوارێکی زمانەکە دەیانناسێتەوە. ئەلفبێ بە ژمارەیەك لەو پیتانە دروست نابێت، بەڵکو دەبێ کۆمەڵێکی تەواوبن بەقەد ژمارەی فۆنیمەکانی زمانەکە بن یان کەمتر بن، چونکە ئەلفبێ سیستەم و ڕێبازی نووسینی زمانەکەیە. دەبێ فۆنیم و دەنگ لەیەك جودا بکرێتەوە. هەموو فۆنیمێك واتایەکی هەیە و دەکرێ پیتێکی بۆ دابنرێ، بەڵام هەموو دەنگەکان ناچنە ناو بواری فۆنۆلۆژی زمان - سیستەمی ڕیزبوونی فۆنیمەکان. ژمارەی (فۆنیم) و (پیتەکان) لە زۆربەی زمانەکاندا بەرانبەر یەك نین، بۆ نموونە ئینگلیزی تەنها (26) پیتی هەیە بەڵام (44) فۆنیمی هەیە. کەچی لەنێوان (پیتەکان) و (فۆنیمەکان) ڕێسایە!

ئەلفبێی تر هەیە کار لەسەر دەنگ ناکات و بەشێوازێکی تر لەسەر پەیوەندی نێوان (پیت و (فۆنیم) دانەمەزراون. لەبریتی ئەوەی پیتێك فۆنیمێك بنوێنێ ، ئەوە مۆرفیمێك ،وشەیەك برگەیەك دەنوێنێ.

لەسیستەمی لۆگۆگرافیدا هەر هێمایەك (وشەیەك)، (مۆرفیمێك) یان (یەکەیەکی واتایی) دەنوێنێ، جۆرێکی تری سیستەمی نووسین هەیە ، بە سیستەمی برگەکاری ناسراوە ، کە هەر هێمایەك برگەیەك دەنوێنێ.

## دابەشبوونی زمانەکان بە گوێرەی سیستەمی نووسین

بێگومان هەموو جۆرەکانی ئەلفبێ (ئەلفابێتیکی و لۆگۆگرافی و برگەکاری) سیستەمی نووسینی زمانن. بیرۆکەی ئەلفابێتیکی (پەیوەندی نێوان پیت و فۆنیم) لەچاو مێژووی سیستەمی نووسینەوە نوێیە. لەکۆندا سیستەمی نووسین زیاتر (وێنەیی) و (بیرۆکەیی) بووە ، هەر بۆیە مێژووی نووسینی لۆگۆگرافی لە ئەلفابێتیکی کۆنترە.

ئەو خەتانەی لەناو کۆمەڵگای کوردی بەر لە هاتنی ئیسلام هەبوون ، هەموو زیاتر لۆگۆگرافی بوون نەك ئەلفابێتیکی ، چونکە ئەوە (هێما) بوو ، نەك (پیت) کە (وشەیەکی) نەك (دەنگێکی) دەگەیاند. هەر لەو ڕوانگەوە، دەکرێ بڵێین سیستەمی نووسین لەزمانی کوردی چ بەشێوەی (کوردی) بێت یان (لاتینی) سیستەمێکی ئەلفبێیە ،هەروەها عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی.

زمانی چینی لەسەردەمی ئێستادا، یەکێ لەو زمانانەیە کە بە سیستەمی لۆگۆگرافی دەنووسرێت ، هەرچی زمانی ژاپۆنییە ئەوە بە سیستەمی برگەکاری دەنووسرێت.





## بنەچەی وشەی ئەلفبێ

لەبەرئەوەی ئێمە کار لەسەر ئەلفبێی کوردی دەکەین، بۆیە بەگرنگی دەزانین لەبنەچەی وشەی ئەلفبێ بکۆڵینەوە.

لەزمانی ئینگلیزی بە وشەی ئەلفبێ دەڵێین alphabet ئەو وشەی alphabet زۆر شرۆڤەی بۆ کراوە، لەوانە: هەندێك دەڵێن ئەو وشەیە، وشەیەکی عیبرییە و لە یەکەم دوو پیتی ئەلفبێی عیبری Aleph و Bet دروست بووە. ئەم بە (ئاسیا )کردنەی چەمکی ئەلفبێ چەند ڕەگێکی هەیە.هەردوو سیستەمێکی هێرۆگلیفی و مێخەکی لە ئاسیا دەرکەوتوون و لێرەوە بەرەو ڕۆژئاوا چوون، هەروەها هەردەم جولەکە حەز دەکەن لەڕێگەی تەوراتەوە ڕەگەزی خۆیان پەسەندتر لەخەڵکان و نەتەوەی تر پیشان بدەن ، ئەوان هەتا بانگەشەی ئەوە دەکەن  کە خودا بەزمانی عیبری قسەی لەگەڵ ئادەم کردووە.ڕای تریش کە وشەی ئەلفبێ هەردەم بۆ بنەچەی (یۆنانی) و (لاتینی) دەگێڕێتەوە.

وشەی (alphabet)ی ئینگلیزی لە وشەی "alphabetum"ی لاتینی هاتۆتە ناو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی. وەختی خۆی ڕۆمانەکانیش لە وشەی "Alphabetos" یۆنانی کۆن دایانتاشیوە، هەروەها یۆنانیەکانیش لەدوو وشەی alpha ـ گاو Bet ـ ماڵ ـ فینیقیەوە وەریانگرتووە. ئەو ڕایەش مەرج نییە هەر لەسەر بنەماو شەنگستی زمانەوانی دامەزرابێت ، لەوانەیە پەیوەست بێت بەو شکۆیەی کە فینیقیەکان لەمێژوودا لەبارەی سیستەمی نووسینەوە هەیانبووە، بەجۆرێ نەك هەر ئەلفبێی ئینگلیزی، بەڵکو هەردوو ئەلفبێی لاتینی و یۆنانیش هەر لە ئەلفبێی فینیقییەوە پەیدابوون.

## ئەلفبێی کوردی پێش ئیسلام

ڕووخانی دەوڵەتی میدیا بەدەست هەخامەنیشینەکان سەرەتای نسکۆو پاشاگەردانی دەسەلاتی سیاسی و حوکمڕانی و شارستانییەتی کورد بوو، هەروەها دەسپێکی ڕێنیسانسی فارسی بوو.

دەوڵەتی میدیا لەسەردەمی زێڕینی ئەسخارس (کەی ئەخسار) سەرەتای دەرکەوتنی سیستەمی دیموکراتی بوو لەڕۆژهەڵاتدا. لەسەردەمی (کەی ئەخسار) نەك هەر میدیا لە داگیرکارانی وەك (مانی و ئۆرارتی، ئەسکیتی) پاك کرایەوە، بەڵکو بەیەکجاری هەڕەشەی ئاشورییەکانیش بووە بەشێك لە ڕابردوو.

مادەکان نەك زمانی نەتەوەیی خۆیان هەبوو، بەڵکو خاوەن ئەلفبێی خۆشیان بوون. زۆرێك لەسەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە (ئاڤێستا) وەك کتێبێکی ئاسمانیی بە خەتی (مێخی) بۆ (زەردەشت) دابەزیوە، بۆیە هەر زەردەشت لەو دەقە ئاسمانیە گەیشتووە، لەپاشان هەر لەڕێگەی زەردەشتەوە خەتی (مێخی) لەناو کوردا بڵاوبۆتەوە. ئەو ڕاڤەیەی زەردەشت بۆ دەقی ئاوێستای کردووە زمانەکەو خەتەکەی بە زمان و خەتی ئاوێستا ناوی دەرکردووە. ئەو خەتەی ئاوێستا لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەنووسرێ و (چل و چوار) پیت لەخۆ دەگرێ. سیمای کوردانەی ئەو خەتە ئەوەیە بەپێچەوانەی فارسییەوە سەر و ژێر و بۆری بە (پیت) دەنووسرێ ، نەك بە (هێما)!

کاتێ کۆرشی (522 ـ 549 پ. ز) لەدایکڕا کورد! (ئەستیاگی میدی) (589 ـ 549 پ. ز) لە ساڵی (549 پ. ز) لەناودەبات ، هەرچی شوێنەواری میدی هەیە، جگە لە زمانی ئایینی ـ زمانی ئاڤێستا ـ لە میدیا ناهێڵێ، بەجۆرێ کاتێ ساڵی 450 پ. ز (هیرۆدۆتسی) مێژوونووس دەچێتە ئێران لەبارەی مادەکانەوە دەنووسێ: **"کە من چوومە ئێران، ناوبانگ و شوێنەواری مادەکان لەناو خەڵکا زۆر کەم بوو بووەوە و





خەڵك ڕووداوەکانی پێشوویان لەبیر نەمابوو"**. ئەمە تەنها لەپەنجا ساڵێکدا ڕوویداوە!

ئەمەو فارسەکان بە گوتەی مێژوونووسان نەك هەر خەتی مێخیان لە مادەکانەوە وەرگرتووە، بەڵکو شیمانەی ئەوەش دەکرێ هەر ئەو ئەلفبێیەی بە ئەلفبێی پارسی بەناوبانگە ، لە مادەکانیان وەرگرتبێ!

کۆرش بۆ ئەوەی حوکمدارییەکەی بە فارسی بکا و لە کاریگەری زمان و ئەلفبێی ماد دابڕێ ، بڕیاریدا کە خەتێکی تایبەت بە فارسی دروست بکرێ، ئەو ئەلفبێیەی کۆرشی بڕیاری دروستکردنی دا، ناوی لێنا "خەتی ئاریان" ، ئەو خەتە لە (36) هێما پێکدێ و لەژووری ناوەوەی کۆشکی (دارا) ئەم هەڵکۆڵینە بەو خەتە دۆزراوەتەوە:

**داریۆس، پاشای مەزن**

**پاشای هەموو پاشایەکان**

**پاشای هەموو نیشتمانەکان**

**کوڕی هیستاسپی ئەخمینی**

**ئەم کۆشکەی دروست کرد!**

لە سەردەمی ساسانیەکاندا (224 ـ 630) گۆڕانێکی تر لە زمان و خەتی کوردی کراوە. ئەو زمانەی کە ناسراوە بە زمانی پەهلەوی ،بە زمانی فارسی ناوزەد کراوە، هەروەها ئەلفبێیەکەی بە فارسی کراوە، کەچی لە بنەڕەتدا ئەم زمانە، زمانی کوردییە. ئەلفبێیەکەش (24) پیت بووە و ئەو چەند قەواڵەیەی لە هەورامان دۆزراونەتەوە، بەو خەتە نووسراون.

جگە لەو قەواڵانەی هەورامان، کتێبی "ئایین کورد" کۆنترین کتێبی کوردییە، کە (ئازەر بورد) جارێکی تر لە دوای زەردەشت کۆی کردۆتەوە و بە زمانی پەهلەوی

نووسیویەتیەوە، هەروەها هەر ئەو ئازەر بووردە ، کە کوڕی هەمەدمی پێشەوای (بائایینا) بووە، ئەلفبێیەکی کوردی لەسەر شێوازی ئەلفبێی پەهلەوی داهێناوە. ئەو ئەلفبێیە لە (42) نیشانە پێکهاتبوو ، هەموو دەنگەکانی زمانی کوردی تێدا بووە. شوێنەواری ئەو ئەلفبێیە نەماوە، بەڵام کوردیەکەی ئێستا دیالێکتی (لوڕ) و (کەلهوڕ) و شوانکارەی کوردە.

لەپێش ئیسلام ئاماژە بەدوو ئەلفبێی تر دەکرێ کە لەناو کورددا هەبووبن: ئەلفبێی ئێزیدی، ئەلفبێی (ماس سۆراتی)یە. ئەو دوو ئەلفبێیە جێی گومانن، ئەگەر هەش بووبن بەتایبەتی (ماسی سۆراتی) دۆزینەوە مێژووییەکەی جێی گومانە.

### خەتی ئێزیدی

هەندێ توێژەر هەوڵ دەدەن ئێزیدییەکان بەگەلێکی کۆن دابنێن و (ئێزیدیاتی)یش بە ئایینێکی کۆن پێناسە بکەن. دەگوترێ کە خەتی ئێزیدیان لە (31) پیت پێکهاتووەو پەڕاوی (جیلوە) و (مەسحەفا ڕەش) و هەندێ نامیلکەی ئایینی تر بەو خەتە نووسراون. لەڕووی مێژووییەوە تەمەنی (جیلوە) و (مەسحەفا ڕەش) هێندە کۆن نییە ، بەو (خەتە) نووسراون. ئەو دوو نامیلکە هەر لەسەدەی (یازدەو) و (دوازدە) زایینی نووسراون، نەك پێش ئیسلام. خاڵێکی تر، ئێزیدی هەموو کرمانجین و (سۆرانی) نین ،کەچی هەردوو دەقی جیلوە و مەسحەفا ڕەش لە سۆرانی نزیکترن نەوەك بائایینی!

ئەمەو هەردوو پیتی (ژ) و (ڤ) بەزۆری لە کرمانجی سەروو هەن نەك کرمانجی ناوەڕاست!



کوردۆلۆجی

### خەتی ماسی سۆراتی

خەتی (بینۆشاد و ماسی سۆراتی) خەتێکی ترە ، کە دەگوترێ زادەی عەقڵی مرۆڤی کوردە. هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بۆ یەك سەرچاوە دەکەن کە باسی ئەو خەتەی کردبێت ، ئەویش کتێبێکە بەناوی "شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام" ناوی ئیبن وەحشییەی نەبەتی کلدانی بە سەرەوەیە.

ئیبن وەحشییە لە نامەیەکدا بۆ (عەبدولمەلیك بن مەڕوان)ی خەلیفەی ئەمەوی دەنووسێت: "کوردەکان زۆربەی نووسراوەکانی خۆیانیان بەخەتی ماسی سۆراتی دەنووسی".

هەندێ نووسەر مێژووی ئەو خەتە دەگەڕێننەوە بۆ 2800 ساڵ بەر لە زایین. لەم ڕوانگەوە دەبێ ئەو خەتە پێش دەرکەوتنی زەردەشت و خەتی ئاوێستا و خەتی پەهلەوی و خەتی ماد و خەتی پارسی بێت.

ئەم خەتە (37) پیت لەخۆ دەگرێ، هەندێ لە ئەدگارەکانی ئەم خەتە وەك لە (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام)دا هاتووە:

1ـ لەدوای پێکگرتنی تەواوی پیتەکانی ئەبجەدی لە (ئەلف)ەوە تا (خێ) ، چەند پیتێکی تریش لەم خەتەدا هەن ، کە لە دەستووری ئەلفبێیەکانی تر پترە.

2ـ پیتی (بێ) و (جێ) جیاکراونەتەوە ، کەچی هێشتا (حەوت) جۆرە پیتی تریش لەم خەتەدا هەیە ، کە لەهیچ زمانێکی تردا نین و دەنگیان لەهیچ ئەلفبێیەکی تردا نییە.

3ـ خەتێکی هێندە ناسراو بووە ، بە سەدان کتێبی پێ نووسراوەو هەتا سەردەمی خەلافەتی ئەمەویش ئەم کەلتورە زمانەوانییە هەر بەردەست بووە.

**چەند وردە سەرنجێك لەسەر ئەم خەتە**

1ـ لەم دوو لاپەڕەی کە نووسەرانی کورد بەنموونە دەهێنینەوە لە " شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام " گومان لە کوردێتی ئەو خەتە دەکرێت. لە دەروازەی حەوتەم ئەوها هاتووە:

"من شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام من ذكر اقلام الملوك التي تقدمت من ملوك السريان، الهرامسة، الفراعنة، والكنعانيين و الكلدانيين والنبط، والاكراد... هەروەها لە لاپەڕەی (134) دا هاتووە.:

صفة قلم اخر من الاقلام القديمة وفيه حروف زايدة عن القواعد الحرفية تدعى الاكراد و تزعم انه القلم الذي كتب به (بينوشاد) و (ماسى سوراتى) جميع علومهما وفنونهما.......

وەك گوتمان گومان لەوەدا نییە کە کورد ئیمپراتۆریەتی خۆی هەبووە و زمانی سیاسی و زمانی ئایینی هەبووە هەتا ماوەیەك زمانی ستاندەری لە کوردستان هەبووە، بۆیە کە ناوی کورد لەو لیستەدا دێت جگە لە ڕاگەیاندنی ڕاستی هیچی تر نییە، بەڵام وشەی (تدعى) و (تزعم) کە لە بەرانبەر هەوڵی کورد لەو بوارە دانراوە ، ڕیسەکە دەکاتەوە خوری، چونکە ئەو دوو وشەیە گومان هەڵدەگرن نەك ڕاستی!

2ـ ئەو خەتەی کە گوایە 2800 ساڵ پێش زایینی نووسراوە ، بەشی دەیەمی پەرەگرافی (1 – 5)ی (یەسنا)ی ئاوێستایە دەقاودەق!

3ـ هەر لە (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام) نووسراوە ، کە ئەحمەدی کوڕی وحشیەی نەبەتی کلدانی هەواڵی ئەم خەتەی لە (3)ی ڕەمەزانی (24)ی کۆچی بۆ عەبدولمەلیك کوڕی مەڕوان نووسیوە. جگە لەمە لەخودا پاڕاوەتەوە کە خودا دەوڵەتەکەی عەبدولمەلیك بپارێزێ! ! لە ساڵی (241)ی کۆچی نەك عەبدولمەلیك ، بەڵکو هیچ خەلیفەیەکی ئەمەوی نەمابوو، چونکە لەساڵی (132)ی کۆچی کۆتایی بە





خەلافەتی ئەمەوی هاتووە! ! ، هەروەها عەبدولمەلیك لە ساڵی (86)ی کۆچی مردووە، جا چۆن ئەو هەواڵەی بۆ نووسراوەو دوعای بۆ کراوە؟!

4ـ ساڵی (241)ی کۆچی ئیبن وەحشییەش لە دنیا نەبووە! !

5ـ عەرەبییەکەی ئەو کتێبە ئەوەندە ناڕێکە بەهیچ جۆرێ لە زمانی یبن وەحشییە ناچێ، بەڵکو زیاتر لە زمانی کوردێك، مەسیحیەك، فارسێك دەچێ ، نەك عەرەبێکی زمانزانی وەك ئیبن وەحشییە!

## ئەلفبێی عەرەبی

ئەلفبێی عەرەبی ئەلفبێیەکی ئەلفابێتیکیە، بە واتای پیتەکانی زمانی عەرەبی دەنگەکان دەنوێنن، بەڵام مەرج نییە پەیوەندی (پیت) و (فۆنیم)ی زمانی عەرەبی پەیوەندییەکی یەك بەیەکی ماتماتیکی بێت.

زمانی عەرەبی (28) پیتی نەبزوێنی هەیە ، کە بەم شێوەیە ڕیزکراون:

**(ا، ب، ت، پ، ج، ح، خ، د، ژ، ر، ز، س، ش، چ، گ، ڤ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، و، ه، ی)**. ئەم پێڕەوە لەسەر بونیادی شێوەی لێکچوونی پیتەکان دامەزراوە ، هەرچەندە هەوڵی تر هەبووە، کە پیتەکانی ئەلفبێی عەرەبی بەگوێرەی دروست بوونیان ڕیزبکرێ، بەڵام هەر لە کۆنەوە پەیڕەوی سیستەمی یەکەم کراوە ، ئەوەی دواوە فەرامۆش کراوە.

## بنەچەی ئەلفبێی عەرەبی

زۆر (ڕا) لەبارەی بنەچەو مێژووی ئەلفبێی عەرەبی لێرەو لەوێ بەدرێژایی مێژوو نووسراون. ڕای (زۆربە) لەسەر ئەوەیە کە سەرەتای دەرکەوتنی ئەلفوبێی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چوارەمی زایینی. بانگەشەی ئەوەش دەکرێ کە ئەم

ئەلفبێیە لەبنەچەدا لە ئەلفبێی نەبەتیەکانەوە وەرگیراوە. هەندێکی تر، دەنووسن کە ئەلفبێی عەرەبی لە ئەلفبێی سریانییەوە گەشەی کردووە. هەرچەندە نەبەتیەکان لە بنەچەدا تیرەکی عەرەب بوون، بەڵام گەڕاندنەوەی ئەلفبێی عەرەبی بۆ ئەلفبێی سریانی، ئارامی ، لە پاشان فینیقی ڕاڤەیەکی سیاسی ـ ئایینی بۆ دەکرێ، ئەگەرنا ئەلفبێی زادەی عەقلێکی جەمعییە لەوەی داهێنانێکی قەومی بێت.

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە پێش هاتنی ئیسلام سێ جۆرە ئەلفبێ لەناو عەرەبدا هەبوون: لە باشووری نیمچە دورگەی عەرەبی ئەلفبێیەك هەبووە ناسراوە بە خەتی (مەسنەد) ، لە (شام)یش ئەلفبێی (فینیقی) هەبووە ، هەرچی لەحیجازە ئەوە ئەلفبێی (سریانی) هەبووە.

هەندێکی تری پاڵپشت بەڕای زانایانی فیلۆلۆژی و شوێنەواری دەڵێن (خەتی حیری) بنەچەی خەتی عەرەبییە. ئەو خەتەش لەڕێگەی هاوتخوبی لەگەڵ عەرەبەکانی حیجاز هاتۆتە ناو عەرەبەکان.

ئەوانەی باوەڕیان وایە کە ئەلفبێی (نەبەتی) گۆڕاوە بۆ ئەلفبێی عەرەبی ئەو بەڵگانە دەهێننەوە:

1ـ نەبەتیەکان خۆیان عەرەب بوون، لە سەدەی پینج و شەشی پێش زایینی هەندێ تیرەی (سامی) بەرەو باکوور کۆچیان کردووە، لەدەوروبەری شاری (بەترا) دەوڵەتێکیان بۆ خۆیان دامەزراندووە، ئەوانە لە قەبیلەی (نەبتۆ) بوون.

2ـ زمانی ئارامی، زمانی لینگوا فرانکا ـ زمانی هاوبەش ـ بووە، بەتایبەتی لەبواری گەیاندن و بازرگانییەوە. هەر ئەوەش وایکردووە ئەلفبێیەکەشیان ببێتە ئەلفبێکی هاوبەش ، چونکە بازرگانی پێویستی بە نووسینە نەك هەر ئاخاوتن. عەرەبە نەبتیەکان بەزمانی خۆیان هەر قسەیان دەکرد، هیچیان پێ نەدەنووسی، بۆیە لەپێناو پێویستی دەوڵەت لەسەر شێوەی ئەلفبێی ئارامی ئەلفبێیەکیان بۆخۆیان





دامەزراند. ئەمە مێژوویێکی زۆری ویست هەتا بۆ یەکەمجار لەسەدەی دووەمی زایینی توانیان ئەلفبێیەکەی خۆیان نووسینی پێ بڵاوبکەنەوە.

هەرچی خەتی مەسنەدە ، ئەوە دەوترێ هاوکات بووە لەگەڵ پەیدابوونی مەملەکەتی (سەبا) لەپێش سەدەی دەیەمی پێش زایینی.

ئەوەی گرنگە لێرە ئەوەیە نە خەتی مەسنەد، نە پیتەکانی نەبەتی و سریانی و ئارامی بە پیتی ئێستای عەرەبی ناچن، ئەو هەموو گریمانەی لەبارەی بنەچەی ئەلفبێی عەرەبییەوە دەگوترێن " زانستی! " نین ، بۆیە ناکرێ لە لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی پشتیان پێ ببەسترێ.

لەسەردەمی دابەزینی قورئان، زاری قورەیش، زاری ئایینی و بازرگانی بووە، هەروەها لەپێش دابەزینی قورئان ئەدەبێك لە جەزیرەی عەرەبی هەبووە، نەناسراوە بە ئەدەبی جاهیلی. ئەو ئەدەبە لەناو عەرەبدا بە ئەدەبێکی پڕ ڕەوانبێژی ناسراوە، حەوت موعەلەقاتەکەی بازاڕی عوکاز بەڵگەن لەسەر نووسینی عەرەبی بەزمانی عەرەبی، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش زاری قوڕەیش بوو بە زاری ستاندەر لە جەزیرەی عەرەبیدا.

هەرچەندە لەسەردەمی پێغەمبەر(د.خ) و سێ خەلیفەکەی یەکەم ،زمانی قورئان زمانێکی بێ خاڵبەندی بوو، بەڵام لەسەردەمی ئیمامی عەلیدا (عەلی کوڕی تالیب) ، ئەبولئەسوەدی دوئلی خاڵبەندی بۆ قورئان دانا، ئەوەش لەدوو ڕووە سەرچاوەی گرتووە:

ئەلفبێی عەرەبی لەو ماوەیە گەشەی کردووە و خوێندەواری لەناو عەرەبان زۆر بڵاوبۆتەوە، جا بۆ ئەوەی عەرەب پیتە لەیەکچووەکان (ج، ح، خ) (ص، ض) (د، ذ) (س، ش) (ع، غ)، (ط، ظ) لەیەك جیابکەنەوە ،هەروەها (سەر)، (بۆر) و (ژێر) لەیەك جیابکرێنەوە ، پەسەندی ئەو کارەی ئەلدوئلی کرا. هەروەها لەسەردەمی ئیمامی

عەلیدا گەلانی غەیرە عەرەبیش ، موسلمان ببوون ،بەتایبەتی (فارس) و (کورد) ،جا بۆ ئەوەی ئەوانیش بەرەوانی قورئان بخوێننەوە ،ئەو خاڵبەندییە پەسەند کرا و جێی خۆی گرت.

بەم شێوەیە لەڕێگەی قورئانەوە ،عەرەب هەم بوونە خاوەن زمانی ستاندەر بۆ قورئان خوێندنەوە و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، هەم بوونە خاوەن ئەلفبێیەك ، کە بەهیچ جۆرێ لە ئەلفبێیەکەی پێش خۆی نەدەچوو!

## ئەلفبێی کوردی و ئەلفبێی عەرەبی

ئەو شێوازە فۆنۆگرافییەی ئەلفبێی عەرەبی ، سەرەتایەکی نوێی ئەلفبێی ئاسیایی بوو بۆ ڕزگاربوون لە ئەلفبێیەکانی تر ، کە هەموو ئەلفبێی (مۆرفۆگرافی) و (ئیدیۆگرافی) و وێنەگرافی بوون.

ئەلفبێی عەرەبی هەوڵێك بوو بۆ ئەوەی موسلمانەکان لەسەر یەك ئەلفبێ کۆك بن و خاوەن ئەو زارە هزری و کەلتووری و شارستانییەتە بن ، هەروەها ئەدگارو تایبەتمەندی زمانی قورئان لەخۆ بگرێت.

کورد و فارس کە موسلمان بوون ،ئەلفبێی خۆیانیان لەسەر شێوازی ئەلفبێی عەرەبی دامەزراند و تایبەتمەندی زمانی خۆیانیان پاراست، بەواتای ئەو پیتە هاوبەشانەی لەهەر سێ زمان هەن ،وەك خۆیان مانەوە، پیتی تایبەت بەخۆیان، کە لەزمانی عەرەبیدا نین ، بۆ ئەلفبێیەکە زیاد کرا.

لەئاکام ئەلفبێی کوردی دروست بوو، ئەو ئەلفبێیەی کورد لەسەرەتای ئیسلامی بوونەوە ئەدەبی خۆی پێ دەنووسێتەوە، ئەلفبێیەکی کوردانەیە ، چونکە تەواو لەگەڵ سیستەمی دەنگی زمانی کوردی دەگونجێت، ئەمەو بەحوکمی ئەوەی ڕێژەی





جیاوازی لەگەڵ پێکچوونی بەئەلفبێی عەرەبی زیاترە ، بۆتە ئەلفبێیەکی سەربەخۆ و هەر کوردێك دەتوانێ ئەلفبێیەکەی خۆی لەعەرەبی و فارسی جیا بکاتەوە.

## پیتەکانی ئەلفبێی کوردی

شێوەی پیتەکانی عەرەبی بەحوکمی هەژموونی ئایینی (زمانی قورئان) و دەسەڵاتی سیاسی حوکمڕانی (راشیدین) و (ئەمەوی) و (عەباسی) لەناو کورددا بڵاوبوونەتەوە.

لەو بیست و هەشت پیتەی زمانی عەرەبی ، شەشیان کە بریتین لە (ث، ص، ض، ذ، ط، ظ) بۆ نووسینی کوردی لەگەڵ زمانی کوردی ناگونجێن، کە دەڵێین زمانی کوردی، مەبەستمان زمانی خوێندن کە زیاتر لەسەر زاری کرمانجی ناوەڕاست بیناکراوە، ئەگەرنا دوو سێ پیت لەو شەش پیتە لەزاری هەورامی بەکارئایین، بەتایبەتی پیتی (ص) لەوشەی وەك (صەد)،بەڵام چەند پیتێکی تر لەکوردی هەن بە (شێوە) و (دەنگ) لەزمانی عەرەبیدانین:(پ، چ، ڤ، گ، ژ، ڕ، ڵ)،زمانی عەرەبی تەنها سێ بزوێنی هەیە ، کە بریتین لە (ا، و، ی) ،هەرچی زمانی کوردییە ،هەشت پیتی بزوێنی هەیە، کە بریتین لە (ئ ، ا ، ە، ێ، ی، ۆ، و، وو). زمانی عەرەبی( سەر ـ فتحة) و (بۆرە ـ ضمة) و (ژێر ـ کسرة)ی هەیە، ئەوانە تەواو واتای وشە دەگۆڕن. لەکوردیدا لە بریتی ئەم هێمایانەدا، فۆنیم (بزوێن) هەیە، بەم شێوەیە:

ـ لەبریتی سەر، فۆنیمی (ە)بەکاردێ.

ـ لەبریتی بۆر، فۆنیمی (و) بەکاردێ.

ـ لەبریتی ژێر، فۆنیمی (ی) بەکاردێ.

ـ قَتَلَ: کوشتی ـ بکەر دیار

ـ قُتِلَ: کوژرا ـ بکەر نادیار

وەك لەمانەی سەرەوە دەردەکەوێ ،زمانی کوردی تەنها ئەو پیتانەی زمانی عەرەبی وەرگرتووە ، کە لەگەڵ پیتەکانی خۆی هاوبەشەو لەڕووی وشەسازی و دەنگسازی و ڕستەسازییەوەش پەیڕەوی پێکهاتە و سیستەمی زمانی خۆی کردووە. بەمجۆرە بە هاوکاری ئەلفبێی عەرەبی ، زمانی کوردی ئەلفبێیەکی کوردی هەیە و سیما و ئەدگارەکانی زمانی کوردی دەنوێنێ ،نەك زمانی عەرەبی.

لەمێژووی نووسینی کوردیدا، ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردی جێگەی مشتومڕ بووە. هەر زمانناسێکی کورد ژمارەیەکی داناوە:

1ـ تایەر سادق ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (34) پیت دادەنێت.

2ـ تەوفیق وەهبی ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (40) پیت دادەنێت.

3ـ شێخ محەمەدی خاڵ ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (27) پیت دادەنێت.

4ـ قەناتی کوردۆییڤ ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (36) پیت دادەنێت.

5ـ جەلادەت بەدرخان ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (31) پیت دادەنێت.

6ـ گیوموکریانی ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (32) پیت دادەنێت.

7ـ د. جەمال نەبەز ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (35) پیت دادەنێت.

8ـ د. کەمال فوئاد ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (34) پیت دادەنێت.

9ـ فازیل نیزامەئایین (2 ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (3) پیت دادەنێت.

10ـ هەژار موکریانی ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (31) پیت دادەنێت.

وەك دەردەکەوێ جیاوازی ژمارەی پیتەکان (23 ـ 40) زۆرە، ئەم ناکۆکییە لە دیاریکردنی ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردی پەیوەستە بە چەند خاڵێکی سەرەکییەوە:

یەکەم: ئەو نووسەرانە (پیت) و (دەنگ)یان لە یەك جیا نەکردۆتەوە.





دووەم: ئەلفبێی زمان و ئەلفبێی فەرهەنگیان تێکەڵ کردووە، کەچی ئەم دووە لەیەك جودان. ئەلفبێی فەرهەنگی بەشێکە لە ئەلفبێی زمان ، نەك هاوتای بێت، لەپاشان بەدرێژی لەم خاڵە دەدوێین.

سێیەم: ژمارەی پیت لە ئەلفبێدا دەبێ تاك بێ نەك جووت، چونکە دوو پیت وێنەی دوو دەنگە، تەنها لەهەندێ شوێن نەبێ !

چوارەم: بێ ڕەچاوکردنی سروشتی زمانی کوردی و لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی، هەندێ پیت لە "کوردێتی" دەخەن !

## جیاوازی نێوان ئەلفبێی زمان و ئەلفبێی فەرهەنگ

لەوانەیە لەهەندێ زمان ئەلفبێی زمان و ئەلفبێی فەرهەنگ یەك شت بن ،ژمارەی پیتەکانی هەردووك وەك یەك بن، ئەو شیمانەیە بۆ هەر زمانێك ڕاست بێت بۆ زمانی کوردی ڕاست نییە، چونکە لەزمانی کوردیدا هەردووك لەزۆر ڕووەوە لەیەك جودان:

1ـ ئەلفبێی زمان تەواوی پیتە بزوێن و نەبزوێنی زمانی کوردی دەگرێتەوە، هەرچی ئەلفبێی فەرهەنگە تەنها ئەو پیتانە دەگرێتەوە کە لەسەرەتای وشە دێن، کەواتە لە کوردی، بزوێنەکان بەشێك لە ئەلفبێی فەرهەنگ پێکناهێنن، چونکە ناتوانن لەسەرەتای وشە بێن، بۆ نموونە پیتی (ر ـ ڕای لاواز) پیتێکی ئەلفبێی زمانە ،نەك ئەلفبێی فەرهەنگ، چونکە کوردی وشەی نییە بە (ر) دەست پێبکات. بەهەمان شێوە (ڵ ـ لامی قەڵەو) پیتێکی فەرهەنگی نییە، چونکە لە کرمانجی ناوەڕاستدا لە دەسپێکی وشەی کوردی نایەت.

2ـ ژمارەی پیتەکانی ئەلفبێی فەرهەنگ لە ژمارەی پیتەکانی ئەلفبێی زمان کەمترن.

3ـ هەردوو پیتی (و) و (وو) لە ئەلفبێی زماندا ،دوو فۆنیمن نەك ئەلۆفۆن، چونکە بەجێگۆڕکێیان دوو وشە دروست دەبێت، وەك:

**كوڕ**

**كووڕ**

بەلاَم لە ئەلفبێی فەرهەنگدا هەردووك دوو ئەلۆفۆنن ،چونكە بەجێگۆڕكێیان وشەی نوێ دروست ناكەن،وەك:

**- وشە**

**- ووشە**

**- وتە**

**- ووتە**

**- وریا**

**- ووریا**

**- ورچ**

**- وورچ**

## فەرهەنگە ناودارەكانی كورد و تێكەڵكردنی هەردوو جۆری ئەلفبێ

فەرهەنگنووسانی كورد وێرای ئەوەی هەردوو ئەلفبای تێكەڵ دەكەن، لەسەر ژمارەی پیتەكانیش كۆك نین، گەورە فەرهەنگ نووسی كورد شێخ موحەمەدی خاڵ لە فەرهەنگە سێ بەرگیەكەیدا دەنووسێ : زمانی كوردی (27 ) پیتی هەیە كە ئەمانەن: (أب پ ج ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ه ی ) هەرچی مامۆستا فازیل نیزامەئایینە هەر چوار پیتی (ح ع غ ق ) بە كوردی دانانێ و ژمارەی پیتەكانی دەكاتە (23 ) پیت، هەرچی مامۆستا هەژار موكریانیە ژمارەی پیتەكان دەكاتە (31 ) پیت.

بەمەش هەردوو ئەلفبایەكە تێكەڵ دەكات : (هەمزە بێ پێ تێ جیم چێ حێ خێ دال ڕێ رێ زێ ژێ سین شین عین غین فێ ڤێ قاف كاف گاف ڵام لام میم نون واو واوی مجهول هێ یێ یای مجهول ) ،هەرچی مامۆستا گیوی موكریانیە لە





فەرهەنگی كوردستان ئەلفبای فەرهەنگی ئاوا دەنووسێ: (ا ب پ ت ج چ ح خ د ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ه ی) ، وێرای ئەمەش فەرهەنگنووسانی كورد لە سەر ژمارەی پیتەكان ، هەروەها جۆری ئەلفبایەكە كۆك نین، هەروەها هەریەكە بە بیانوویەك پێتێك زیاد دەكات، یان كەم دەكات مامۆستا فازیل نیزامەئایین هە رچوار پیتی (ح ع غ ق ) بە كوردی دانانێ و دەڵێ هاتوونەتە ناو زمانی كوردیەوە، گیوی موكریانیش (ع غ ) بە كوردی دانانێ، هەر ئەمەش وای لێكردووە لە زۆر شوێن (ح غ ) تێكەڵ بكات.

هەرچی مامۆستا خاڵ و مام هەژارە ئەوە هەر چوار پیتیان بە كوردی داناوە و پەیڤیان بۆ هەر چوار پیت هێناوەتەوە، مامۆستا خاڵ لەو چەند لاپەڕەیەدا وشەی بۆ چوار پیتە هێناوەتەوە(ح47–57 )، (ع357–361 )، غ362–364 )، (ق541–594 ) لە فەرهەنگی شارەزووری د. شەفیق قەزاز دا وشە بۆ ئەم چوار پیتە هێنراوەتەوە، لە لە فەرهەنگی كوردستانش لە لاپەرە (341–350 ) وشە بۆ پیتی (ح) هێنراوە بۆ پیتی (ق )یش لە لاپەرە (682–727 ) وشە بۆ پیتە هەیە.

## پێشنیار

بە حوكمی ئەوەی نووسەر ی ئەم چەند دێرە، چوار پێنج ساڵە خەریكی كاری فەرهەنگ نووسینە، ئەوە لە پرۆسەی فەرهەنگ نووسیندا بۆی دەركەوتووە كە زۆربەی فەرهەنگە كوردییەكان تەواو ڕەچاوی ئەلفبای فەرهەنگی ناكەن، بۆ یە زۆر گرنگە فەرهەنگ لە سەر بنەمای ئەلفبای فەرهەنگی بنووسرێت، هەروەها زۆر گرنگە لە سەر ڕێزبەندی پیتەكانیش هاو ئاهەنگییەك هەبێت هەروەها جیاكردنەوەی بزوێن – نیمچە – نەبزوێن زۆر گرنگە، چونكە ئەمەش لە ڕۆنانی وشەدا ڕۆڵی خۆی دەبینێت.

لە كۆتایدا كە دەڵێین "فەرهەنگی كوردی " دەبێ فەرهەنگی هەموو كورد بێت نەك تەنیا زارێك، ئەمەش زمانی ستاندەر بە هێز دەكات هەر بۆ نموونە فەرهەنگی كوردی –

کرمانجی خواروو (سۆرانی ) لە پیتی (ڤ ) زۆر هەژارە، بەڵام کرمانجی سەروو زۆر دەوڵەمەندە لەم پیتەدا، بۆیە بە بەکارهێنانی هەر ئەم دوو زارە سەرەکییەی باشووری کوردستان، زۆر وشەی کوردی لە فەوتان ڕزگار دەبێت.

## مێژووی نووسین بە ئەلفبێی کوردی

مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفبێی کوردی ،دەکرێ بۆ سێ جۆر پۆلین بکەین:

جۆری یەکەم: ئەو نووسینە کوردیانەی تەنها بەپیتی عەرەبی نووسراون، نەك بە تەواوی ئەلفبێی کوردی.

جۆری دووەم: ئەو نووسینانەی هەندێك لە پیتە کوردییەکانیان بەشێوەی جیاواز لە ئێستا بەکارهێناوە، هەروەها تەواو ڕزگار نەبوونە لە (سەر) و (بۆر) و (ژێر).

جۆری سێیەم: ئەو نووسینانەی لەدوای سەدەی بیستەمەوە هێور هێور بەهەندێ گۆڕانکاری بچووکەوە لەگەڵ ڕێنووسی ئێستا تەواو لەیەك دەچن.

**جۆری یەکەم:**

دەکرێ دوو بەیتەکانی بابەتاهیری هەمەدانی (935 ـ 1010) بەدەسپێکی ئەو هەوڵە دابنێین. هەندێك دەڵێن ئەو شیعرانە بە ئەلفبێی فارسی نووسراون ، جا ئەگەر ئەم ڕایە ڕاستیش بێت ، ئەوە ئەلفبێی فارسی هەنگاوێك لە ئەلفبێی عەرەبی لەکوردییەوە نزیکترە، چونکە هەندێ پیتی کوردی و فارسی (ئەوانەی لەعەرەبیدا نین) وەك یەکن.

کتێبە ڕێزمانییەکەی (عەلی تەرەماخی ) ، کە لە ساڵی (1591 – 1592 زایینی) بە ناوی دەستووری زمانی عەرەبی، بە کوردی نووسیویەتی، یەکێ لەو کتێبە دانسقانەیە کە بە کوردییە ، بەڵام بە ئەلفبێی عەرەبی نووسراوە. ئەمەو (مەلا





مەحموودی بایەزیدی) ئاماژە بە سێ کتێبی تر دەکات کە بە کوردی نووسراون، ئەویش: مەولودنامەی کرمانجی مەلای باتەیی، نەوبەهاری ئەحمەدی خانی و هەر سێ پەرتووکی مەلا یونسی هەلکەتینییە. ئەو سێ کتێبە لەگەڵ کتێبەکەی عەلی تەرەماخی ، کتێبە ناسراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەمی خۆیان بوون.

دەکرێ دیوانە شیعرییەکەی مەلای جەزیری و مەم و زینی ئەحمەدی خانی لەو دەقانەی کە بەهەندێ گۆڕانکاری کەم ، لەچاو ئەوانەی پێشوو ، هەر بە ئەلفبێی عەرەبی نووسراون.

**جۆری دووەم:**

بەیتی ئەوەڵ و ئاخیر (تذکرة العوام)ی سەعید عەبدوڵڵا موکری لەساڵی 1199ی کۆچی بەرانبەر 1784زایینی، بە کوردی نووسیویەتی. نووسەر لە هەندێ شوێن فۆنیمی (ە، و، ی) لەبریتی (سەر) و (بۆر) و (ژێر) بەکارهێناوە ، بەڵام لەهەندێ شوێنی تر سەرو بۆرو ژێری بەکارهێناوە.(عەقیدەی مەولەوی) کە ئەحمەدی کوڕی حەمدی بەڵخەیی لەنێوان ساڵانی 1308 هەتا ساڵی 1317 نووسیویەتی ، نەك هەر سێ فۆنیمەکەی بەکارهێناوە، بەڵکو لە زۆربەی شوێن پیتە کوردییەکانی وەك (پ، چ)ی بەکارهێناوە.

وەك چاپەمەنیش، دیوانەکەی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) کە لە ساڵی 1844 لە ئەستەمبوڵ چاپکراوە ، بە یەکەم کتێبی کوردی دادەنرێت ، کە زۆرێك لە پیتە کوردییەکان و هەر سێ فۆنیمەکەی بەکارهێناوە.

فەرهەنگی "الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردیة" ، کە یووسف زیائەددین پاشای خالیدیە، کە لە ساڵی 1893 لە ئەستەمبوڵ چاپیکردووە، ڕۆژنامەی کوردستان 1898 – 1902 پیتە کوردییەکان و هەرسێ فۆنیمەکەی زیاتر چەسپ کرد.

**جۆری سێیەم:**

دامەزراندنی حوکمداری شێخ محمود و دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکانی پێشکەوتن و هەرسێ ڕۆژنامەکەی سەردەمی دەسەڵاتی شێخ مەحموود و گۆڤاری (دیاری کوردستان) 1925 –1926 و گۆڤاری گەلاوێژ ( 1939–1949) و گۆڤاری هەتاو ،نەك هەر لە نووسینەکاندا پەیڕەوی ئەلفبێی کوردییان کرد، بەڵکو بە دەیان وتار و لێکۆڵینەوەیان لەسەر چەندەها بابەتی زماننناسی و زمانی کوردی بڵاوکردەوە. بەڕاستی ئەوان بوونە دەسپێکی ئەلفبێی کوردی ، ئەمەو خوێندن بە کوردی لە باشووری کوردستان، تەواو ئەلفبێی کوردی لە باشووری کوردستان جێگیر کرد.

**کەواتە پیتەکانی ئەلفبێی زمانی کوردی ئەمانەن:**

**(ئـ ا ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل ڵ م ن ھ ە و وو ۆ ی ێ i ).**

ئەو پیتانە هەموو پیتەکانی زمانی کوردین، هەموو فۆنیمن، چونکە هەریەکەی لە بریتی ئەویتر بەکاربێت، واتای دەگۆڕێت، هەروەها ئەوانە پیتی بزوێن و نەبزوێنن.

هەرچی پیتەکانی ئەلفبێی فەرهەنگن ،ئەمانەن:

**(ئـ ب پ ت ج چ ح خ د ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن ھ و ی)**

ئەوانە تەنها ئەو پیتانەن کە بە پیتی نەبزوێن ناسراون، چونکە تەنها ئەوانە دەتوانن لە سەرەتای وشەی کوردی بێن، ئەو دوو پیتە (و،ی) هەرچەندە هەمان فۆرمی هەر دوو پیتە بزوێنی کوردیان هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە دەتوانن لە سەرەتای وشەی کوردی بێن، بۆیە ئەوانەی لەو چوارچێوەیەدا نەبزوێنن ، نەك بزوێن.





**خوێندنەوەی ئەلفبێی زمان**

| پیت / وێنە | دەنگ |
|---|---|
| ئـ | هەمزە |
| ا | ئەلیف |
| ب | بێ |
| پ | پێ |
| ت | تێ |
| ج | جیم |
| چ | چ |
| ح | حێ |
| خ | خێ |
| د | دال |
| ر | ڕێ |
| ڕ | ڕێ |
| ز | زێ |
| ژ | ژێ |
| س | سین |
| ش | شین |
| ع | عەین |
| غ | غەین |
| ف | فێ |
| ڤ | ڤێ |
| ق | قاف |

| | |
|---|---|
| ك | کاف |
| گ | گاف |
| ل | لام |
| ڵ | ڵام |
| م | میم |
| ن | نوون |
| ھ | هێ |
| ە | ئە |
| ۆ | ئۆ |
| و | ئو |
| وو | ئوو |
| ی | ئی |
| ێ | یێ |
| i | بزرۆکە |

**دامەزرێنەری ئەلفبێی کوردی**

سەرەڕای ئەوەی کورد بەبێ کێشە ئەلفبێی عەرەبی لە مزگەوت و قوتابخانە ئایینیەکان وەرگرت، بەڵام هیچ بەڵگەو دەستنووسێك نییە ، نەك هەر لەبەرایی ئیسلامبوونی کورد و هەتا لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسیشدا هەوڵێك بۆ ئەلفبێی کوردی درابێت. جیاوازی زمانی کوردی لە عەرەبی لەڕووی پێکهاتە و فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژییەوە بێگومان وای لە (مەلا) و (فەقێ) و (شاعیر)ی کورد کردووە ، ناوەندێك بدۆزنەوە بۆ گوزارشت کردن لە زمانی خۆیان، ئەو هەوڵەی نووسین بە





زمانی کوردی بە ئەلفبێی عەرەبی چ لەلایەن کوردەوە یان کوردناسانەوە ، تەمەنی زۆر درێژ نەبووە.

سەدەی نۆزدەهەم بە سەرەتای ڕێنیسانسی زمانی کوردی دادەنرێت، چونکە لەو سەدەیەوە بەدواوە بە بەردەوامی کار لەسەر زمانی کوردی کراوە.

هەوڵی نووسین بە زمانی کوردی لەگەڵ دروستکردنی ئەلفبێیەکی کوردی لەسەر ئەلفبێی عەرەبی ، دوو شتی لەیەك جودان، وەك پێشتر وتمان هەوڵی زۆر لە پێشترە لە پرۆسەی داڕشتنی ئەلفبێیەکی کوردی. لەدوای بزاڤی دەستورخوازی لە تورکیا، ماوەیەك 1908 – 1910 دەرفەت بە کوردان درا چەند پێکۆڵێکی نەتەوەیی بکەن. کەسە ناودارەکانی ئەو دەمەی بزاڤی کوردی بریتی بوون لە (مەلا سەعیدی نورەسی، ئەمین عالی بەدرخان، خەلیل خەیالی، د. عەبدوڵلا جەودەت و پیرەمێردی شاعیر و چەندانی تر). بە شاهێدی ئەو زاتانە، خەلیل خەیالی، کە هەردەم بە فەرهەنگ و ڕێزمانی کوردییەوەخەریك بوو و بە دامەزرێنەری ئەلفبێی کوردی دادەنرێت ، کتێبەکەی خەلیل خەیالی ناوی (ئەلیفبای کرمانجی)یە ، لە ساڵی 1909 لە ئەستەمبوڵ چاپکراوە، کتێبەکە تەنها (27) لاپەڕەیە، بەڵام زادەی عەقڵی کوردییە. ئەم ئەلفبێیەی خەیالی، لەسەر بنەمای ئەلفبێی فەرهەنگی دروستکراوە، بۆیە لە ڕیزبەندی ئەلفبێیەکەدا ،بزوێنەکان دیارنەکراون،هەروەها هەندێ پیتی عەرەبی لەناو ئەلفبێیەکەدا هەن ، کە بریتین لە (ص، ض، ط، ظ) ،هەروەها هەرچەندە لەڕۆژنامەی کوردستان 1989 ـ 1902 کەم و زۆر چارەسەری (سەر، بۆر، ژێر) عەرەبی کراوە، بەڵام لە ئەلفبێیەکەی خەیالیدا (سەر و بۆر و ژێر) دانەنراون، بەڵکو تەنوینی عەرەبی لەو شوێنانە دیاریکراوە.

ئەو هەوڵەی خەلیل خەیالی 1876 ـ 1926 لەژێر کاریگەری دەسەڵاتی کەمالیەکان لەلایەك و ئەلفبێیەکەی جەلادەت بەدرخان لەلایەکی تر لەباکوری

کوردستان نەیتوانی ڕەگی خۆی دابکوتێ ، بەڵام لەباشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان مێژوویەکی پرشنگداری لە عەقڵی مەعریفی مرۆڤی کورد تۆمارکرد. لەدوای ئەو هەوڵەی خەلیل خەیالی لە باشووری کوردستان زۆر هەوڵ دراون، بەڵام ئەو هەوڵانە بە ئەلفبێ نەناسراون، بەڵکو زیاتر بە ڕێنووسی کوردی ناسراون، کە دەکرێ ئەوها ڕیزیان بکەین:

1ـ تۆفیق وەهبی، 1925، بەچۆن حرۆفێك و چۆن بنووسین .
2ـ حەقی شاوەیس، 1925، ئیملای کوردی ـ حروفاتی عەرەبی.
3ـ سەعید سدقی کابان، 1928، مختصر صرف و نحوی کوردی.
4ـ مەعروف جیاوك، 1930، بەرگی ئیملای کوردی.
5ـ ئەحمەدی عەزیز ئاغا، 1936، ئەلفبای کوردی.
6ـ وتارە زمانەوانییەکانی گۆڤاری گەلاوێژ (1939 – 1949).
7ـ وتارە زمانەوانییەکانی گۆڤاری هەتاو .
8ـ ئیبراهیم ئەمین باڵدار، 1953، ئەلف و بێی نوێ بۆ منداڵان.
9ـ عەلائەدین سەجادی، 1960، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی.
10ـ تاهیر سادق، 1969، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی .
11ـ حامید فەرەج، 1976، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا.
12ـ نەسرین فەخری، 1977، ڕێنووسی کوردی.
13ـ مستەفا نەریمان، 1981، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە.
14ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف، 1986، نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی.
15ـ محەمەد زەهاوی، 2006، مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی.
16ـ هوگر تاهیر تۆفیق، 2008، ئەلیفبای کوردی.





بەسەدان سەرچاوەی تر هەن. مامۆستا دەتوانێ داوا لە قوتابیان بکات بیلیۆگرافیەك پێکبێنن.

### هۆکاری گەشەکردنی ئەلفبێی کوردی لەناو کورداندا

کاتێ لە پرسی (زمان) و (ئەلفبێ) دەکۆڵینەوە یەکسەر ئاراستەی گوتارەکەمان بەرەو ڕووی توێژی خوێنەوار و ڕۆشنبیران و مەکتەبلیی دەبێتەوە.

فارس و کورد لەمێژوودا چەندەها ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتی (بە تەنیا) و (هاوبەشیان) هەبووە، ئەمە لەلایەك پەیوەندی بە (خزمایەتی زمان و ڕەگەز)ەوە هەیە، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی بە (هاومێژوویی) و (هاوکەلتووری ڕۆشنبیری) و (هاوسنووری)یەوە هەیە.

ئەو دوو نەتەوە خاوەن شارستانیەتە کە ئیسلام بوون ، هەوڵیاندا سوود لە ئیسلام وەرگرن ، بۆ برەودان بە شارستانیەتی خۆیان، بەحوکمی ئەوەی (ئیسلام)یش ئایینێکی جیهانییە و نەتەوەیی نییە، بۆیە هەردوو نەتەوە لە ئایینەکە نزیکبوونەوە.

ئەو نزیك بوونەوەی عەقڵی مەعریفی کورد و فارس دەبوو هەر لەڕێگەی مزگەوت و مەڵبەندی ئایینییەوە لەگەڵ عەقڵی مەعریفی عەرەبەوە پێك بگەن. فێربوونی زمانی نوێش هەر لەڕێگەی ئەلفبێوە دەبێت، بۆیە هەردووکیان بۆ نووسینی خۆیان سوودیان لەو ئەلفبێیەوە وەرگرت.

ئەو بزاڤە مەعریفییە هەر بەردەوام بووە، ئەلفبێی عەرەبیش بەبێ هیچ بەرەنگارییەك سەرەڕای ئەو هەموو کێشە سیاسی و مەزهەبیانەی کە لەنێوان گەلانی موسلمان بەرپا ببوون ، هەر لە پێشڕەوی دابوو.

لەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقیش، دەستەبژێری ڕۆشنبیری کورد دەستبەرداری ئەو ئەلفبێیە نەبوو، بەڵکو لەماوەی (88) ساڵدا 1921 ـ 2009 ئەلفبێی کوردی بە ئاقارێکدا بردووە، کە هیچ گرفتێکی زانستیی و زمانەوانیی نەمێنێ و لەباشوور ببێتە هۆکارێك بۆ کارکردن لەسەر زمانێکی فەرمی و یەکگرتوو.

## گیروگرفتی ئەلفبێی کوردی

با بزانین ئەلفبێی کوردی گیروگرفتی هەیە؟! ئەوەی هەندێ سەرەدەری لە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی دەردەکات، قەناعەتێکی زانستی لەلا دروست دەبێت، کە ئەو گیروگرفتانەی هەندێ ڕێزمانووس و زمانەوانیی کورد باسی لێوە دەکەن، زۆربەیان زادەی تێڕوانینی خۆیانن، نەك زمانی کوردی!

ئەو بۆچوونە پەیڕەوییە بۆ سروشتی زمان ، هیچ ئاکامێکی دروستی لێنەکەوتۆتەوە، بۆیە بەڕاشکاوی دەڵێین دەستووری ئەلفبێ کوردی بە بەراورد لەگەڵ هەر سێ زمانی جیهانی: عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی هیچ ئارێشەیەکی نییە مەحاڵ بێ! . زیاتر لە ملیارێك مرۆڤ زمانی عەرەبی دەخوێنێتەوە ، بەشێکی زۆری ئەو ژمارەیەش عەرەب نین و شێوازی نووسینی زمانی خۆیان لەڕووی ئەلفبێ و پێکهاتەو خێزانی زمانییەوە لە عەرەبی جودان. سەبارەت بە کوردان، زمانی عەرەبی هەر زمانی دەقی ئایینی (قورئان) نییە، بەڵکو زمانی خوێندنیش بووە.

ئەوەی لە عەرەبی بە (بۆر) و (ژێر) و (سەر) و (وەستان)ناسراون ، لە کوردیدا وەك (فۆنیم) دەردەکەون:

كَتَبَ: نووسی ، ئەو نووسی

لە کوردی لە بریتی (سەر)، (ە) بەکاردێ .وەك : کەچەڵ، بەرە.....

كُتِبَ: نووسرا

لە کوردی لە بریتی (بۆر) ،(و) بەکاردێ،وەك: کوردی، کوڕ...........





هەروەها لە بریتی (ژێر) ،لە کوردی (ی) بەکاردێ،وەك:بیر، میر،..........

ئەمەو لە عەرەبی چەندەها پیت هەن ،دەنگیان زۆر لەیەك نزیکە، هەمووش لەڕووی فۆنۆلۆژییەوە فۆنیمن، چونکە لەڕووی فۆنەتیکەوە شوێنی تایبەت بەخۆیان هەیە: وەك:

ـ ذ، ظ، ض، ز

ـ ث، ص، س

ـ ط، ة، ت

لە زمانی کوردیدا تەنها پیتەکانی کۆتایی ئەم کۆمەڵانەی (ز، س، ت) هەیە !

گیروگرفتەکانی زمانی ئینگلیزی زۆر زیاترن لە گیروگرفتەکانی زمانی عەرەبی ، لەزمانی ئنیگلیزیدا ئەم کێشانە هەن:

1ـ دەنگی /ش/ لەچەند جۆرە (چەند پیتێ) دروست دەبێت.وەك:

sh :Ship کەشتی

ch :Chic کۆك

su :Sugar شەکر

tio :Nation نەتەوە

ci :Social کۆمەڵایەتی

ssio :Passion سۆز

هەردوو پیتی (ch) هەندێجار بە/چ/ و هەندێجاری تر بە /ك/ دەخوێنرێتەوە:

/چ/: teacher, cheap, chiken

/ك/: ache, chemistry

2ـ پیتی (c) بەو دەنگانە /س/، /ش/، /ك/ دەخوێنرێتەوە

/س/: city, bicycle

Social/ش/:

:/ك/cake, car

3ـ هەردوو پیتی (ea) بەچەند شێوەیەك دەخوێنرێنەوە

/ێ/head, dead, read

/یی/seat, dean, bean

هەروەها کارەکانی زمانی ئینگلیزی ،ئەوەندی نارێسان ، ئەوەندە ڕێسایی نین.

زمانی فەرەنسی یەکێ لەو زمانانەیە (بە ئاسانی!) بەبێ مامۆستای فەرەنسی ، فێربوونی ئەگەر مەحاڵ نەبێ ، زۆر دژوارە !

1ـ زۆر کات ئەگەر وشەی فەرەنسی کۆتایی بە بزوێنێك نێت، ئەوە نەبزوێنەکەی کۆتایی وشە ناخوێنرێتەوە.

برنج /غی/ Riz

پەنیر/لێ/ Lait

بۆن /پاغفا/ Parfum

هەندێجار ئەم یاسایانە پێشێل دەکرێت:

ئێوارە / سواغ/ Soir

ئازیز / شێغ/ Cher

ڕەش /نواغ/ Noir

کەسك /ڤێفت/ Vert

2ـ گێندەر لەم زمانە لەسەر بنەمای پۆلینکردنی بایۆلۆژی نییە، بۆیە لە (ئاخاوتن) و (ڕستە) دروستکردندا ، مرۆڤ تووشی هەڵەی زۆر دەبێ، ئەمەو فەرەنسی وەك زمانی عەرەبی ، ڕێککەوتنی گێندەری لە نێوان بکەر، کار، ئاوەڵناودا هەیە.

3ـ خوێندنەوەی فەرەنسی لە (قورسیدا) بە ئینگلیزیش بەراورد ناکرێ!





**ئایا زمانی کوردی ئەو کێشانەی هەیە؟!**

ئەوانەی ناویان لێنراوە گیروگرفت (لەسەردەمێکدا) هەبوون، بەڵام ئێستا ئەوانە یان نەماون یان بەرەو نەمان دەچن.

هەندێ لەو گیروگرفتانە:

1ـ جیانەکردنەوەی(و) ئامرازی پەیوەندی /u/ لەگەڵ پیتی (و) /w/.

زمانی کوردی یەك شێوەی هەیە بۆ ئەم دوو جۆرە(و)، بەڵام ئەوەی سەلیقەی زمانەوانی هەبێ ، بە ئاسانی لەیەکیان جیا دەکاتەوە:

ـ (و) پەیوەندی لەنێوان دوو وشە، دوو گرێ ،دوو ڕستە دەبێت.

ـ ئەو (و)ی لەسەرەتای وشە دێت، نەبزوێنە، بزوێن نییە، چونکە وشەی کوردی بە بزوێن دەست پێناکات.

2ـ (وو) فۆنیمە یان ئەلەفۆن؟!

لە ڕێنووسی ئیستای کوردیدا (وو) لەسەرەتای وشە نانووسرێت، لەبریتی(و) دەنووسرێت،وەك:

ـ ووشە وشە

ـ ووتە وتە

ـ وورچ ورچ

لەهەندێك شوێن (وو) ئەلۆفۆنە، چونکە واتا ناگۆڕێت.وەك:

دوو دو

دوور دور

بەڵام لە شوێنی تر، فۆنیمە، چونکە واتا دەگۆڕێ،وەك:

کوڕ کووڕ

3ـ دەرنەکەوتنی بزرۆکە.

پێویست ناکات بزرۆکە لەڕێنووس بنووسرێ، بەڵام با لە ئاستی فۆنۆلۆژی ئاماژەی پێبکرێت، چونکە لەهەندێ وشەدا لە خوێندنەوە دەرکی پێ دەکرێ. دیارکردنی بزرۆکە لە ڕێنووس کێشە دروست دەکات ، نەك کێشە چارەسەر دەکات:

- مل
- دڵ
- سل
- شڕ

دانانی هەر هێمایەك ، ئەوە واتای ئەو هەموو وشانە دەگۆڕێت:

- میل
- دیل
- سیل
- شیڕ

ئەمەو خۆی بزرۆکە نە (فۆنیمە) و نە (ئەلۆفۆنە)!

4- دانانی هێماکان هەر بۆ (جوانی) و (پێویستی) نییە، بەڵکو ئەو هێمایانە فۆنیمی نوێ دروست دەکەن. جیاوازی نێوان (ڕ ، ر) و ( ڵ ، ل) وەك جیاوازی نێوان /ف، ڤ/ و/ ك، گ/ وایە.

5- هەبوونی چەند (ی) ، پەیوەندی بە لێکسیکۆلۆژی و ڕۆنانی وشەی کوردییەوە هەیە، نەك پرۆسەیەکی ڕەمەکی بێت، کورد بە سەلیقە ئەو وشانە لەیەك جیادەکاتەوە:

شین - شیین

مەی - مەیی

ماین - مایین





ئایا ئەمانە کێشەن؟ ئارێشەن؟ گیروگرفتن؟! ئایا بە گفتوگۆی ئەکادیمیانەی مامۆستاو قوتابی چارەسەر ناکرێن؟!

## ئەلفبێی لاتینی

ئەلفبێی لاتینی وەك ئەلفبێی کوردی، ئەلفبێیەکی فۆنۆگرافییە، بۆ دەنگ، پیت دانراوە، نەك هێما و وێنە.

لە ئەلفبێی عەرەبیدا ژمارەی پیت و دەنگ هاوسەنگن ، بەڵام لە ئەلفبێی لاتینیدا ئەو دیاردەیە مەحاڵە ، بەتایبەتی لە زمانی ئینگلیزیدا، چونکە ژمارەی پیت و دەنگەکانی ئینگلیزی نەك هەر هاوسەنگ و نزیك نین، بەڵکو ئەو (26) پیتەی زمانی ئینگلیزی ، (44) فۆنیم دروست دەکەن.

## * مێژووی سەرهەڵدانی ئەلفبێی لاتینی

کۆنترین نووسین کە بە ئەلفبێی لاتینی نووسرابێت ، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شەشەمی پێش زایین. ئەو نووسینەش لە ئەلفبێی (ئەتروسکان Etruscan) لەسەدەی حەوتەمی پێش زایین وەرگیراوە. لەسەرەتا ئەلفبێی لاتینی ژمارەی پیتەکانی وەك ئێستا نەبوو، بەڵکو تەنها (21) پیت بوون.

شێوەی زۆربەی پیتە بەراییەکانی ئەم ئەلفبێیە لەگەڵ ئەوەی ئێستا ، لەیەك جودان، هەر چ نەبێ زۆرێکیان لەگەڵ ئەوانەی بەراوژون،هەروەها هەندێکیان وەك لەگەڵ ئەوەی ئێستا لەیەك ناکەن وەك (q - x) (l - G) .

دەسەڵاتی سیاسی (داگیرکردنی وڵاتان) و بڵاوکردنەوەی ئایین (بەتایبەتی مەسیحیەت) ، هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەلفبێی لاتینی بوون لەهەردوو بەشی ئەوروپا (ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات).

لەپاش داگیرکردنی یۆنان ، پیتەکانی ئەلفبێی لاتینی لە (21) بوون بە (23). هەردوو پیتی (Y) و (Z) لە ئەلفبێی یۆنانی وەرگیراون بۆ نووسینی ئەو وشانەی لە یۆنانیەوە وەرگیراون. لەپاشان پیتی (k)یش هەر لە یۆنانی وەرگیراوە بۆ ئەو وشانە لەڕەسەندا یۆنانین، هەروەها هەرسێ پیتی (j, u, w) لەدوای ئەو پرۆسە سەربازی و ئایینیانە بۆ ئەو ئەلفبێیە زیادکران. ئەمەش تەنها بۆ ئەو زمانانە بوو، کە ئەو پیتانەیان هەبوو، نەك زمانی لاتینی، چونکە زمانی لاتینی ئەو سێ پیتەشی نەبوو، بۆیە لە ئەلفبێیە بەراییەکەدا نەبوون.

*** کورد و ئەلفبێی لاتینی**

لەدوای ئەلفبێی عەرەبی، ئەلفبێی ئەرمەنی لەناو کوردان بڵاوبۆتەوە، هۆی بڵاوبوونەوەی ئەلفبێی ئەرمەنی لەناو کوردان ،پەیوەستە بە کاری موژدەگەرانەوە. مێژووی دەرکەوتنی ئەم ئەلفبێیە لەناو کوردان دەگەڕێتەوە بۆ بەراییەکانی سەدەی پازدەهەمەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی پاڵنەرێکی ئایینی لە پەنای بڵاوکردنەوەی ئەو ئەلفبێیە بووە ، کە تەنها ئینجیلەکان و چەند نوێژو دوعایەکی مەسیحیانە بە زمانی کوردی ، بەو ئەلفبێیانە بڵاوکراونەتەوە ،نەك دەقێکی ئەدەبی یان بابەتێکی مێژوویی یاخود فەلسەفی!

پێویستە نووسین بە لاتینی و پەیدابوونی ئەلفبێی لاتینی بۆ زمانی کوردی لەیەك جودا بکەینەوە.هەر چوار نەتەوەی (ئیتالی، فەرەنسی، ئەلمانی، ئینگلیز) لەو نەتەوانەن کە بە ئەلفبێی لاتینی زمانی خۆیان دەنووسن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو ئەلفبێیە ، ئەلفبێیەکی نەتەوەیی نییە، پیاوانی ئەو چوار نەتەوەیە بەناوی ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسییەوە هەر لە سەدەی سێزدەهەمەوە هاتوونەتە کوردستان و شتیان لەسەر کەلتور و زمان و ئایین و مێژوو و عادات و تەقالیدی کورد نووسیوە، وا چاوەڕێ دەکرێ کە ئەوانە بە زمانی خۆیان و ئەلفبێی لاتینی ئەو نووسینانەیان





نووسی بێت ، نەك بە زمانی کوردی و ئەلفبێی عەرەبی ، چونکە هەردووکیان باش نەزانیوە، هەروەها هەتا سەدەی هەژدەهەم چاپی پیتی عەرەبی کاری پێنەکراوە.

بەڵام هەوڵدان بۆ نووسینی کوردی بە ئەلفبێی لاتینی لەلای ڕۆشنبیرو خوێندەواری کوردەوە مێژووەکەی ئەوها کۆن نییە، بەڵکو سەرچاوەکان سەدەی بیستەم بەسەرەتای ئەو هەوڵە دادەنێن.

سەبارەت بە دامەزرێنەری ئەلفبێی لاتینی لەناو کوردان ، ڕای جیاواز هەیە. هەندێك دەڵێن (لوتفی فیکری) دامەزرێنەری کۆمەڵەی کوردستانی خۆشەویستان لەساڵی 1912 هەوڵی داوە ئەلفبێیەکی لاتینی بۆ زمانی کوردی دابنێت. لەلایەکی دی( فائیز بەگ) و (عەبدوڵڵا جەودەت) لە ساڵی 1913 کاریان بۆ ئەو جۆرە ئەلفبێیە کردووە. لە باشووری کوردستانیش ئاماژە بە هەوڵی (شوکری فەزلی) شاعیر دەکرێ، جگە لەو هەوڵانە، لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و تورکیای نوێ، دەستەیەك لە خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی کورد بە نامیلکە هەوڵیان داوە ئەو ئەلفبێیە لەناو کوردان بسەپێنن، ئەو هەوڵەش ئەوەندە (سیاسی) و (ئایینی) بووە ،(زمانەوانی) نەبووە.

لەدوای سەقامگیربوونی هەردوو دەوڵەتی تورکیا و عێراق، ئەم ئەلفبێیانە لە باکوورو باشووری کوردستان نووسراون:

1ـ ڕێزمانا ئەلف و بێیا کوردی، میر هەرە کۆل ئازیزان (جەلادەت بەدرخان) 1932، 20 لاپەڕەیە.

2ـ خوێندەواری باو، توفیق وەهبی، 1938، 44 لاپەڕەیە.

3ـ ئەلفبێیا من، د. کامەران بەدرخان، 1938، 32 پەڕەیە.

4ـ ئەلفبێیا کوردی، عوسمان سەبری، 1955، 56 لاپەڕەیە.

5ـ نووسینی کوردی بە لاتینی، جەمال نەبەز، 1957، 35 لاپەڕەیە.

6ــ ئـەلف و بێــی کــوردی وێنــەدار بــەپیتی لاتینــی، گیوموکریــانی، 1960، 43 لاپەڕەیە.

چەندانی تر....

## گیروگرفتی ئەلفبێی لاتینی

هەندێ پیت لە کوردی هەن ، وەك (ژ، ش، ح، غ، چ..) بە تەنها پیتێکی سادەی لاتینی نانووسرێن ،بەڵکو دەبێ پیتێکی تریان بۆ بکرێ بە بنەچە ، وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ز | Z | ژ | Ž |
| س | S | ش | Š |
| هـ | H | ح | ħ |
| خ | X | غ | x |

هەروەها لەو شـەش نامیلکەیـەدا ، جیـاوازی لـەنێوان (ك) و (ق) نـەکراوە، هـەتا هەندێك دەوێرن بڵێن (ق) پیتێکی کوردی نییە !

(بزرۆکـە ـ i ) و (ی ـ î) لـە فۆرمـدا زۆر لەیـەك نـزیکن ، بۆیـە ئەگـەر وەسـتایانە مامەڵە لەگەڵ ئەو دووە نەکرێت، ئەوە چەندەها وشەی کوردی تێکەڵی یەك دەکرێن، وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| پیت | Pît | پت | pit |
| فیت | Xît | فت | Xit |
| میل | Mîl | مل | mil |

شێوەی پیتە لاتینیەکانی (مێجەرسۆن) و ( ئەدمۆنز) و (تەوفیق وەهبی) لەسەر سیستەمی زمانی ئینگلیزی دامـەزراون، بۆیـە هەنـدێکیان زۆر جـودان لەگـەڵ ئـەوەی جـەلادەت بـەدرخان (کـە زیـاتر لەسـەر تـورکی دامـەزراوە) یـان ئـەوەی (عوسمـان سەبری) و (جەمال نەبەز) (کە لەسەر فەرەنسی دامەزراون).





| | | | |
|---|---|---|---|
| چ | ch | č | ç |
| ش | sh | š | ş |
| غ | gh | x | x |

هــەردوو فــۆنیمی /ڕ/ و /ڵ/ لــە نووســینی کــوردی کرمــانجی ســەروو ، هێمـا جیاکردنەوەیان لە /ر/ و /ل/ بۆ داناندرێت، ئەم دیاردەیە هەتا لـە بەشـێك نووسـینی نووسەرانی بائاییینی لە ئەلفبێی کوردیش هەیـە، ئـەو دووەش بەشـێوەی جیـاواز لـەو نامیلکانە نووسراون، هەروەها ئەگەر هێمایان بۆ دابنرێ ، وەك ئەلفبێی کـوردی هـەر کێشە نییە؟!

هەروەها شـێوەیبزوێنەکانی نـاو ئەلفبێیەکـەش، بـێ کێـشە نییـە، (ــە) بـە (e) هەندێجار بـە (a) نووسـراوە: لێـرە(ئـەو ew ) و (ئـاو aw ) بـە ئـەلفبێی کـوردی تێکەڵ دەکرێن:

هەروەها (ـە) و (ێ) لەو نامیلکانە تێکەڵ دەکرێن:

ئــەوە ewa ئــەوها دەنووســرێن ، بــەڵام (ئێــوە) لــە هەنــدێکی تــر لەیــەکتر جیاکراونەتەوە:

ئەوە ewa

ئێوە ĕwa

ئەی سەبارەت بە سیستەمی ڕێنووسی کوردی، کە وشـەی کـوردی بـە بـزوێن دەسـت پێناکات، ئەلفبێی لاتینی وەڵامی چی پێیە؟!

ئا ـ (ئـ + ا ) لە لاتینی بە /ä/ نانووسرێت، ئەی نەبزوێنی کوردی لەکوێیە؟!

هەروەها وشەی (ئێستا)، لە دوو بڕگـە پێکـدێ و (ئـ) نەبزوێنـە ، کەچـی لـە لاتینـی بزوێنە( ĕs / ta ) .

## له بارەی ئەدەبەوە

هەموو ئەو چالاکییانەی ئادەمیزاد لە بواری داهێنانی گوتەیی ئەنجامیان دەدات، یان (زانست)ن و یانیش (هونەر)، ئەدەب دەکەوێتە خانەی هونەرەکان، وەکو هەر یەکە لە (مۆسیقا) و (ڕەسم) و (بیناسازی)و...هتد وایە.. جیاوازی نێوان (زانست) و (هونەر)یش بێگومان زۆرە، یەك لە گرنگترینی ئەو جیاوازیانە ئەویە، کە (زانست)ەکان هەر کامەیان بن، شتانی گشتین و سوود بە هەمووان دەگەینن، بۆ نمونە: کارەبا، میکانیك، پزیشکی، کیمیا، فیزیا، ئابوری، زەویناسی، زیندەوەرزانی و...هتد، هەموو ئەوانە بەرهەمەکانیان بۆ هەمووانە، سوودەکانیان دەڕژێتە خانەی گەورەو بچوك، زانا و نەزان، شاری و لادێیی و هەموو کەسێك، لە هەر شوێن و کاتێك بن، کەسیش ناتوانێت لە سوودی ئەو زانستانە چاوپۆشی بکات و بلێت: (من پێویستم پێیان نییە).. بەڵام (هونەر)ەکان شتی تایبەتین، پەیوەندییان بە زەوق و سەلیقەی خەڵکێکی تایبەتەوە هەیە، دەشێ ئەو شیعرەی بە لای کەسێکەوە جوان بێت، بە لای یەکێکی دیکە جوانی تیا نەبێت، یان ئەو پارچە مۆسیقایەی خەڵکێك پەسندی دەکات، دەشێ دەیان کەسی دیکە ڕەتی بکەنەوە، ئەو گۆرانییەی هەندێ کەس لەزەتی لێوەردەگرن، دەشێت خەڵکێکی زۆر لەوان زیاتر حەز بە بیستنی نەکەن، ئەو تابلۆیەش کە سەرنجی یەکێك ڕادەکێشێت، دەشێت زۆرێکی تر بەلایانەوە گرنگ نەبێت و بەم شێوەیە.

## ئەدەب

ئەدەب لە رووی (وشە)ییەوە، نواندنی خوڕەوشت و هەڵسوکەوتی جوانە لە مامەڵەو پەیوەندی کردن لەگەڵ کەسانی بەرامبەردا، بەو شێوەیەی کە عورف و عادەت و ئایین و نەریتی هەر کۆمەڵگایەك پەسندییەتی.





بەڵام (ئەدەب) وەکو (زاراوە) لە واتا وشەییەکەی جیایە، بریتییە لە نواندنی هونەر لە (گوتە) و (قسەکردن)دا، کە لە گەلێ ڕووەوە پێناسەی کراوە، وەکو لە خوارەوە هەندێ لەو پێناسانەی دەخەینە ڕوو.

## چەند پێناسەییێکی ئەدەب

ئەدەب وەکو هەر بابەتێکی دیکەی بواری هونەر پێناسەی زۆری بۆ کراوە، هەندێ لە گرنگترینی ئەو پێناسانە لەمانەی خوارەوە کورتدەکەینەوە:

1ـ ئەدەب: یەکێکە لە هونەرەکان وەکو ڕەسم و مۆسیقا و بیناسازی و ... هتد وایە، بەڵام جیاوازی لەگەڵ هەموو ئەو هونەرانەی تر لە کەرەسەکەیەتی، کەرەسەی مۆسیقا (دەنگ)ە، کەرەسەی ڕەسم (بۆیە)یە، کەرەسەی بینا ئەو دار و بەرد و ئاسن و شتانەی ترە، کە بینایان پێ دروست دەکرێت، کەرەسەی (ئەدەب)یش (وشە)یە.

2ـ ئەدەب: تۆماری بیری پەسندە.

واتە: دەقە ئەدەبیەکان لە هەموو سات و سەردەمێکدا هەمیشە پارێزگاری لە داب و نەریت و ئەقڵیەتی بەرزو تێگەیشتنی جوان بۆ گەردوون و ژیان دەکەن و ئەوە لەخۆدا هەڵدەگرن، کە کۆمەڵگا بەرەو کەناری ئارامی و خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی دەبەن.

3ـ ئەدەب: بریتییە لە ڕەنگدانەوەی باری ژیانی کۆمەڵگا لە هەموو ڕووەکانی ئایینی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەقڵی و فیکری و دەروونی و ڕۆشنبیری و...هتد.

4ـ ئەدەب داڕشتنێکی هونەرییە بۆ ئەزموونێکی شیعری.

## مێژووی سەرهەڵدانی ئەدەب

مێژووی سەرهەڵدانی ئەدەب بۆ مێژووی سەرهەڵدانی بیری نواندنی هونەر لە قسەدا لە لای ئادەمیزاد دەگەڕێتەوە، کە ئەم مێژووە بە ڕۆژ و مانگ و ساڵ دەستنیشان ناکرێت، چونکە مێژوویکە بەر لە دەستپێکردنی نووسینە، بەڵام بە وردبوونەوە دەگەینە ئەو ڕایەی، کە هەر لەگەڵ درووستبوونی یەکەم کۆمەڵەی مرۆیی لەسەر پشتی ئەو زەوییە، لە قسەکردندا هونەر نوێندراوەو خەڵکێك هەبووە بە هۆکاری جۆراوجۆر هەمیشە بە بەراورد لەگەڵ خەڵکانی تر قسە خۆشتر و پوختتر و بەهێزتر بووە، قسەکانی پوخت و چەشەدار بوونە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا ئەدەب بووە، بە واتا سادەکەی.

## ئەدەبی کۆنی میللەتان

ئەدەبی کۆنی تەواوی ئەو میللەتانەی مێژوویەکی دێرینیان هەیە، پێی دەگوترێت ئەدەبی فۆلکلۆر.. (فۆلکلۆر) زاراوەیەکە مێژوویەکی دیاریکراوی هەیە، بۆ یەکەمجار لێکۆلەری ئینگلیز (ولیەم جۆن تۆمس) لە لێکۆلینەوەکانی خۆیدا ساڵی 1867 ئەو زاراوەیەی (فۆلکلۆر)ی بۆ هەموو ئەو بەرهەمانەی ئەدەبی کۆن بەکار هێنا، کە خاوەنیان دیارنەبوو و بە ئەدەبی سەرزاری دەناسران، ئینجا لە دوای ئەو، لێکۆلەرانی ئەوروپاو لێکۆلەرانی ڕووس و عەرەب و کورد و نەتەوەکانی تریش بەکاریان هێنا، ئەمەش چونکە زاراوەیەکی گشتگیرە سەرجەم فۆڕم و شێوەکانی ئەدەبیاتی فۆلکلۆر دەگرێتەوە، لێکۆلەرانی لە زاراوەی نەتەوەیی و ناوچەیی زۆر و لەیەکجیا دەربازدەکرد، چونکە کە دەڵێیت فۆلکلۆر، لای کورد و عەرەب و فارس و ئینگلیزو سەرجەم گەلانی دیکەی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا هەر هەمان واتا دەگەینێت،





بۆیە بە زوویی هەموو نەتەوەیەك پەسندی کردو بەشی کۆنی ئەدەبە سەرزارەکەیان بەو ناوە پۆلێن کرد.

## تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر

ئەدەبیاتی فۆلکلۆر چەندین تایبەتمەندی هەیە، لەوانە گرنگترینیان:

1ـ خاوەنی دیار نییە، ئەوەش لەبەر دوو هۆ:

أ ـ مێژووی بەشێکی ئەو بەرهەمانە بۆ سەردەمی پێش سەرهەڵدانی نووسین دەگەڕێتەوە، کە ئەوسا بە دەم و پشتاو پشت لێرەو لەوێ گێڕدراوەتەوە، بۆیە خاوەنی ڕاستی ئەو بەرهەمانە ون بووەوەو دەگوترێت میللەت خاوەنییەتی.

ب ـ بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان وەکو دروشم و نوکتەو حەکایەت و قسەی خۆش و بابەتانی دیکە، ڕۆژانە لەگەڵ پێشهاتەکان درووستدەبن و سەرزاری لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بڵاودەبنەوە، ئەمانەش هێندە زۆرن و هێندە بە بڵاوی بەکاردەهێنرێن، عیبرەت لە واتاکانیانە نەك لە ناوی خاوەنەکانیان، بۆیە خەڵك دەقەکە دەگوازێتەوەو سوودی لێوەردەگرێت، بەڵام کەس خاوەنەکەی ناناسێت، کە ئاسانیش نییە هەموو جارێ بگوترێ ئەو بەرهەمە هی فلانە، تەنانەت خاوەنەکەیشی مەبەستی بڵاوبوونەوەی پەیامی دەقەکەیەتی، نەك بڵاوبوونەوەی ناوی خۆی.

ئەم دوو هۆیەش بەسن بۆ ئەوەی ئەو دەقانەی کۆن و نوێی ئەدەبی فۆلکلۆری خاوەن ون بکەن و بێ خاوەن بکەونە خانەی کەلتوری ئەدەبی و فیکری نەتەوە.

2ـ زمانی بەرهەمەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر زمانێکی سادەیە، زۆر بە کەمی دەربڕینی قوڕسی تێدەکەوێت.

3ـ شێوازی دارشتنی بەرهەمەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر ئەویش ئاسان و سادەیە، هەر ئەو شێوازەی قسەکردنە، کە خەڵکی بە گشتی پێیەوەی دەدوێن و لادان بە کەمی

نەبێ تیایدا ڕوونادات، ئەگەر ڕوویشی دا بە زۆری لادانەکە واتاییە، وەکو (خوازەو خواستن و کینایە)، کە ئەمانە لە نوکتەو ئیدیۆم و پەندەکان بە دیاردەکەون و ڕەمزی جوانیان تیا بەکاردەهێنرێت، ئەو ڕەمزانە ئاسانن و خەڵك بە ئاسانی دەیانناسێتەوە.

4ـ بەرهەمەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر لە چەندین فۆرمی وەکو: ئەفسانە ـ حەکایەت ـ پەندی پێشینان ـ مەتەڵ ـ نوکتە و...هتد دەردەکەون.

5ـ لە ئاستی هونەریدا بەرهەمەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر نزمترن لە بەرهەمەکانی ئەدەبی نووسراو.

6ـ ڕۆژانە بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان درووست دەبن و ژیان بەرەوپێش دەبەن، هەبوونی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەری بەربڵاویش، نەك ڕێگە لە بەردەوام دروستبوونی فۆلکلۆر ناگرن، بەڵکو زۆرجار دەبنە هۆی بە خێرایی بڵاوبوونەوەی ئەو دەقە نوێیانەی فۆلکلۆر.

7ـ زۆرێکی بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان، لەبەر ئەوەی گوزارشت لە ئێش و ئازارە مرۆییەکان دەکەن، سنووری نەتەوە دەبڕن و لای زۆربەی نەتەوەکانی تر، بە زمانی خۆیان دەگێڕدرێتەوە، بەوەش سیمای نەتەوەیی کەمتر بۆ دەقی ئەدەبی فۆلکلۆری درووست دەبێت و زۆرتر ئەو بەرهەمانەی فۆلکلۆر وەکو ئەدەبی جیهانی دەردەکەون.

### ئەرکەکانی ئەدەبیاتی فۆلکلۆر و ئەدەب بە گشتی

ئەدەب بە شێوەیەکی گشتی و ئەدەبیاتی فۆلکلۆریش بە شێوەیەکی تایبەتی ژمارەیەك ئەرکیان هەیە، دەکرێ گرنگترینیان لەمانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:





1ـ پارێزگاری کردن لە قەوارەی مەعنەوی کۆمەڵگا.. واتە پاراستنی بیروباوەڕ و عورف و عادەت و خووڕەوشتی جوانی باپیران، بۆ ئەم مەبەستە هەمیشە دەقە فۆلکلۆری و ئەدەبییەکانیش بە گشتی بە دوو شێوە کار دەکەن، لە لایەك بەها ڕەوشتییەکانی وەکو (ڕاستی، ئەمانەتپارێزی، دەستپاکی، خۆشەویستی، تەبایی، ...هتد) بە جوان نیشان دەدەن و خۆشەویستیان دەکەن، لەو لاوەش دژە بەهاکانی وەکو (درۆ، ناپاکی، دزی، ڕق و قین و دژایەتی، ناڕێکی... هتد) ناشرین دەکەن و هەمیشە بەو شێوەیە پیشانیان دەدەن، کە مرۆڤەکان لە ئەنجامی خراپییان وشیار ببنەوەو بۆیان دەربکەوێت ئەم دژە بەها خراپانە چ زیانێك لە مرۆڤەکان دەدەن.

2ـ بەرەوپێشبردنی گوێگر یان خوێنەر لە هەموو ڕووێکی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەقڵی و...هتد.

3ـ بەخشینی لەزەت بە گوێگر، یان خوێنەر، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو بەلاغەت و جوانکاری و شێوازە جۆراوجۆرە جوان و کاریگەرانەی ئودەبا دایدەهێنن.

4ـ کردنەوەی ئەقڵی مرۆڤ و گەورەکردنی، ئەوەش بە تێگەیاندنی مرۆڤەکان، کە دنیا زۆر گرنگتر و گەورەترە لەوەی هەریەکە تێیگەیشتووە، ئەگەر یەکێك وابزانێت ئەوەی هەیەتی تەواوی شتە باشەکانە، ئەوا لە ڕاستیدا وا نییە و زیان دەکات، چونکە بەم تێگەیشتنە نا دروستەی ڕێگەی بەرەوپێشچوون لە خۆی دادەخات و لە دواکەوتوویدا چەقدەبەستێت، ئەگەریش یەکێك پێی وابێت لە تاریکی و دووریانێکی سەخت کەوتبێ، ئەوا ئەدەب دەیخاتە سەر ئەو ڕێیەی، کە ڕێگە چاری دەربازبوونیش هەر دەمێنێ و مرۆڤی مافخوراو و ڕاست لە ئەنجامدا هەر سەردەکەوێت.

5ـــ زۆرێکــی بەرهەمــە ئــەدەبی و فۆلکلۆرییــەکان ڕۆڵــی بــاش دەبیــنن لــە پەروەردەکردنی منداڵاندا، حەکایەت و چیرۆك و پەند و قسەی خۆشی جۆراو جۆر شتی جوانی لێکجیا فێری منداڵان دەکەن و بەرەو سەرکەوتنیان دەبەن.

## بەشەکانی ئەدەبی فۆلکلۆر

ئەدەبیاتی فۆلکلۆر چەندین فۆرم، یان جۆری گرنگی هەیە، لێرەدا تیشك دەخەینە سەر ئەوانەی، کە زۆر زەق و گرنگن، کە بریتینە لە:

### یەکەم: ئەفسانە

کۆمەڵێك حیکایەتی کۆنن، هەموو شتەکانی ناویان لە (پاڵەوان ـ کەرەسە ـ کات ـ شوێن ـ ڕووداو) ئەفسانەیین و ڕاستەقینە نین.. بۆ نمونە:

أ- لە واقیعدا مرۆڤ ئەگەر بوو بە دوو پارچە ئیتر ناتوانێت ئەرك ببینێ و ڕۆڵی تەواو دەبێت، بەڵام لە ئەفسانەدا دەشێت بە تەنیا (سەر)ێك یان (کەرتە مرۆڤ)ێك ڕۆڵ ببینێت.. جگە لە مرۆڤیی ناتەواو، دیسانەوە (دێو و درنج)، (باڵندەی عەنقا)، ...هتد، کە بونیان نییە، ڕۆڵ دەبینن و دەبنە پاڵەوانی ئەفسانەکان.

ب ـ لە ئەفسانەدا دەشێت (کلاو) یان (دەفر) یان (سنی) یان (سێو)ێك هەر کارێك بکەن، کە لە واقیعدا ئەقڵ قەبوڵی ناکات، بەڵام لە ئەفسانەدا ئەوە ئاساییەو ئەو شتانە دەبینرێن.

ج ـ کات لە ئەفسانەدا کاتیی ڕاستەقینە نییە، ئەو شەو و ڕۆژە ئاساییە نییە کە مرۆڤ دەیانزانێت، بەڵکو دەشێت کاتژمێرێك بە قەد سەد ساڵ، یان زیاتر لە نێو ئەفسانەدا درێژ بێت.





د ـ شوێن لە ئەفسانەدا شوێنی ئاسایی نییە، بەڵکو (دوورگەی واق واق)، یان (بنی دنیا)، یان هەر شوێنێکی ترە، کە ئەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پەیان پێ ببات و قەبوڵیان بکات، چونکە لە واقیعدا بوونیان نییە.

هـ ـ ڕووداو لە ئەفسانەدا ئاسایی نییە، بەڵکو سیمایەکی ئەفسوناوی وەردەگرێت و بە خێرایی بەرەوپێش دەچێت.

### دووەم: حەکایەت یان سەربردە

ئەمانە کۆمەڵێك ڕووداوی ڕاستەقینەن، خەیاڵ لە دارشتنەوەیاندا ڕۆڵ دەبینێت، بەلام گرنگ ئەوەیە لە چوارچێوەی ئەقڵدان، ئادەمیزاد کە دەیانبیسێت، لەگەڵیان تێکەڵ دەبێت، دەزانێت ئەو شتانەی بیستنی ڕاستن، ڕوویانداوە، یانیش دەشێت ڕوو بدەن.. ئەوانەش دوو جۆرن:

أ ـ هەیانە بە زمانی گیانداران گوزارشت دەکەن.. ئەم حەکایەتانە دیارە ڕەمزین و بیرۆکەی بەهێز بە شێوەیێکی ئاسان پێشکەش دەکەن، بۆیە زۆربەی حەکایەتی لەم شێوەیە بۆ منداڵان دەگێڕدرێتەوە، منداڵ پێیان دڵخۆش دەبێت و چێژی خۆشیان لێوەردەگرێت، لە هەمان کاتدا لەو بوارەش کە حەکایەتەکە چارەسەری دەکات، منداڵان پێیان پەروەردە دەبن، لە هەمان کاتدا گەورەش سوود لەو حەکایەتانە دەبینن و چێژ و ئەقڵیەتی خۆش و جوانیان لێوەردەگرن.. نمونەی ئەو جۆرە وەکو حەکایەتی (مەڕۆکە و بزنۆکە) کە ئەمە زۆر بەناوبانگە، حەکایەتی (دایکە بزن و کاریلەکانی)، حەکایەتەکانی بە زمانی (ڕێوی) و (شێر) و (سەگ) و (پڵینگ) و ... چەندانی دیکە.

ب ـ هەیانە بە زمانی مرۆڤەکان گوزارشت دەکەن.. ئەم حەکایەتانە بە زۆری حەکایەتی پاشایانن، واتە ئەو حەکایەتانەن، کە پاشایان تێیاندا بە زۆری بە دیار

دەکەون، هەروەها تەواوی خەڵکی تریش چ لە تەك پاشاکان و چ لە شوێن و بوارەکانی دیکەی ژیان لەگەڵ یەکتری بە دیاردەکەون.

## ئامانجی حەکایەتەکان

بە شێوەیێکی گشتی ئامانج لە حەکایەتیش چەند شتێکە، لەوانە:

1ـ بەخشینی چێژ و لەزەتی تایبەت بە گوێگران.

2ـ کردنەوەی ئاسۆی بیر و دەوڵەمەندکردنی حیکمەت و تێگەیشتنی خەڵکی لەمەڕ مەسەلە گرنگەکان، بۆ ئەوەی لە کاروانی دوورودرێژی ژیاندا بێکێشە بن و بە ئاسانی بتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن.

## سێیەم: پەندی پێشینان

ئەمانە پوختەی بیر و ئەزموونی مرۆڤن، هەموو بوارەکانی ژیان لە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و کشتوکاڵ و ئایین و دەروون و...هتد دەگرنەوە.. لەبەر گرنگییان پێناسەی زۆریان بۆ کراوە.. یەکێك لەمانە:

پەندی پێشینان بەشێکە لە ئەدەبیاتی فۆلکۆر، زۆرینەی خەڵکی لە کۆڕ و دانیشتنە تایبەتیەکانی خۆیانەوە دووبارەی دەکەنەوە، دەیکەنە یاساو بنەمای ئەوتۆ فەلسەفەی ژیانی خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن، لە ڕوانگەیەوە بۆ شتەکان دەڕوانن، بە هۆیانەوە لە کاتی ئەنجامدانی هەر کارێکەوە هەر لەسەرەتاوە دەست بە هەندێ بیری پێشینە دەگرن، کە تەسلیمی دەبن و بڕوای پێدەکەن، بۆیە ئەو پەندانە کاریگەری گەورەیان هەیە، لەسەر دەروونی زۆرینە





## گرنگی پەندی پێشینان

گرنگی ئەو پەندانە لەوەدایە، کە ئەو پەندانە هەریەکەو دوای ئەزموونێك درووست بووەو وەك باپیران خۆیان دەڵێن: (هەر عەقڵەك لە خەسارەکی).. واتە: لە هەر زیانیێ، لە هەر نووشستیێك، کە لە ئەنجامی گرتنەبەری کارێکدا لە بواری کۆمەڵایەتی، یان سیاسی، یان بازرگانی و...هتد، تووشی مرۆڤ دەبێت، مرۆڤەکان ئەزموونێکیان لا درووست بووەو زانیویانە دەبوو کارەکەیان بەوجۆرە نەکردباو ئەگەر جارێکی دیکە بیریان لە ئەنجامدانی کارێکی هاوشێوە کردەوە، ئەوا دەبێ ئاواو ئاوای بکەن، بۆ ئەوەی لە هەڵەی جاری گۆڕین نەکەونەوە، یان ئەنجامی ئەمجارەیان لەوەی پێشوو باشتر بێ و ڕێگەیان ئاسانتر و دەستکەوتیان بەسوودتر بێت.

ئەم پەندانە ئەگەرچی ڕۆژگاری درووستبوونیان بۆ مێژوویێکی زوو بگەڕێتەوەو ئێستا نە شوان و گاوان و سەپان وەك جاران، نە گیشەو درووێنەو شۆبڕینی وەکو ئەوسا، نە ژیانی سادەو دەوارنشینی و کۆچەری پێشوو، نە خەڵکانیش لە ئاستی بیری و ڕۆشنبیری وەکو ئەوسا نەمابن، چونکە ژیان لە زۆربەی ڕووەکانەوە بە هۆی تەکنەلۆژیاوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام زۆرینەی پەندەکان کۆن نابن و بە بەرەوپێشچوونی سەردەم و نوێبوونەوەی هۆکارەکانی ژیان ئەوانیش خۆیان دەگۆڕن و بە گیانێکی نوێوە دێنەوە پێش، دیسانەوە بە هێزەوە خۆیان دەچەسپێنن، چونکە ئەگەر دەربڕینەکانیشیان سادە بن و بە زمانی ئاخاوتنی ئاسایی خەڵکی بن، بەڵام چەمکەکانیان بەهێزەو لەودیوی دەربڕینەکانەوە، دووری دیکەیان هەیەو خزمەتی گەورەتر دەکەن، ئەوەتا کە کاتێك ئەو پەندەی پێشینان دەڵێت: (دۆستت هەزار بێ کەمە، دوژمنت یەك بێ غەمە)، دەبینین ئەگەرچی لە ژیانی شارستانی ئەمڕۆی لە سایەی تەکنۆلۆژیاوە سەرقاڵی زۆربەی خەڵکان و هەبوونی دەزگا جۆراو

جۆرەکانی پۆلیسی ئاسایی و نەهێشتنی تاوان و ئاسایش و..هتدیش، لەگەڵ بوونی ناوەندیەت لە یاساش، کە وابەستەی بوونی حکومەتن، ئیدی نە دۆستە زۆرەکان وەك ئەوسا خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی هەر تاکێك دەکەن، نە بە تەنیا دوژمنەکەش دەتوانێت لەشکرکێشی بکات و دوژمنەکەی تێکبشکێنێ و لە نێوی ببات، چونکە دادگاو لێپرسینەو پرنسیپە نێونەتەوەییەکان هەنە، بەڵام دیسانەوەش مرۆڤ لە دۆستدا هەر چاوەڕوانی چاکەیە، بە پێچەوانەوە بە هۆی بووی ناحەز و دوژمنیشی با بچوکترین کەسیش بێت، هەر ناڕەحەتەو ناتوانێت دڵنیا بێت، واتە: لە بەرامبەر بچوکترین دوژمنیشدا مرۆڤ هەر گرژ و نائارمەو هەمیشە لە مەترسی ئەوەدا دەژی، ئەگەر ڕاستەوخۆش نەبێ، ئەوا ناڕاستەوخۆ پیلانێکی لە دژدا بگرێ و زیانێکی لێبدات، کەوابێت بۆ ئەمڕۆش پەندەکە هەر بە زیندوویی ماوەتەوەو دڵی لە لێدان نەکەوتووە، بۆیە ئێستاش بە بڕوایەکی زۆرەوە، خەڵکان یەکدی بەوە ئامۆژگاری دەکەن، کە: (دۆستت هەزار بێ کەمە، دوژمنت یەك بێ غەمە).

## جۆرەکانی پەندی پێشینان

پەندی پێشینانی کورد بە شێوەیەکی گشتی یان ڕستەیەکی سادەیە یان دێڕێك یان دوو دێڕە هۆنراوەیە.. بۆ نمونە:

یەکەم: ڕستەیەکی سادەی واتادار:

- کای کۆن بە با مەکە
- هەر ئەقڵەك لە خەسارەکی.
- کوتك دەزانێ قۆناغ لە کێیە.
- هەر عەقڵەك لە خەساڕەکی.
- زمان بیەڵێ سەر سەلامەتە





- نەزان بە پێیەك زانا بە دوو پێ تێدەکەوێ

دووەم: دێڕە شیعرێك:

- ئازار بە ئازار دامەمرکێنە
بشرەنجێ دڵی کەس مەڕەنجێنە
- ئازایی باوان بە واریسی نابڕێ
زۆر وەجاغزادە لە برسا ئەمرێ

## تایبەتمەندییەکانی پەندی پێشینان

1- بە زمانی سادە داڕێژراون.

2- شێوازی درووستبوونی ڕستەکانیان شێوازی قسەکردنی ئاساییە.

3- چەمکی بەهێز پێشکەش دەکەن.

4- بەرانبەر زوو تێیان دەگات و بەم هۆیەوە قسەکەر بە ئاسانی مەبەستی خۆی دەپێکێت، واتە: ڕێگا کورتکەرەوەیە بۆ قسەکەر و بۆ گوێگریش.

5- بە هەموو بوارەکانی ژیان شۆڕبوونەتەوەو هیچ بوارێك لە بوارەکان، یان لایەنێ: لە لایەنەکانی ژیان نەماوە، کە پەندی شیاو بەخۆی نەبێت.

6- لەسەر زاری هەموو خەڵکانن، واتە: خۆیان بەر لە ناوی خاوەنەکانیان بڵاوبوونەتەوە، بۆیە خاوەنیان ونەو میللەت هەمووی خاوەنیەتی.

7- هەر بە هۆی زۆر بڵاوییان لە هەر شوێنێك، یان هەر قسەکەرێك بە شێوەیەك پەندەکان بەکاردێنێت.

**چوارەم: ئیدیۆم**

کۆمەڵێك ڕستەی هێما ئامێزی کورتە، گوزارشت لە شتە جۆراوجۆرەکان دەکەن، بە وشەو دەستەواژەی کورت واتای گەورەو زۆر دەگەینن.. بۆ نمونە:

أ ـ دوو زمانە.. واتە: (کەسێکە لای تۆ بە زمانێك و لای بەرامبەرەکەت بە زمانێکی دیکە قسە دەکات)

ب ـ دەستی کورتە.. واتە: (کەسێکی هەژارە)

ج ـ زمانی درێژە.. واتە: (لە قسەکردندا زۆر دەڵێت و سنوری شەرم و حەیا ناپارێزێت، هەرچی بێتە سەر زمانی دەیڵێت)

د ـ قەوانی هەڵناگرتەوە! واتە: ڕووحی گەورەیە

هـ ـ بە هەموو دەمێ ماڵی لەسەر پشتی کەرێیە! واتە: لە چ جێیان نیشتەجێ نابێ و نازانێ لە جێیەك خۆی بگونجێنێ، یانیش نایەڵن لە چ جێیەکی ماوەیێك بمێنێتەوە، چونکە کرێچییەو هەژارە خانووی خۆی نییە.

و ـ دارەکی لە ڕووحی دام! واتە: زیانێکی گەورەی پێ گەیاندم و گەلێکی ئازار دام.

## پێنجەم: نوکتە

ئەمانە کۆمەڵێك باس، یان حیکایەتی کورتن، شێوازێکی کۆمیدییان هەیە، مەبەستیانە واقیعێکی خراپ لە ڕووێك لە ڕووەکانەوە زەقتر بکەنەوە، بە زۆربەی لایەنەکانی ژیاندا شۆڕبوونەتەوە، بەڵام لە زۆربەی سەردەمەکاندا و لە سەردەمی نوێش بە تایبەت نوکتەی سیاسی گرنگی تایبەتی پێدەدرێت و بەردەوام لە زۆربوون و درووست بوون دەبێت. بۆیە وەکو هەر هونەر و فۆڕمێکی دیکەی ئەدەبی پێناسەی زۆر بۆ نوکتە کراوەو لە ڕەهەندی لێکجیاوە تەماشای کراوە.. لە خوارەوە هەندێ لەو پێناسانە دەخەینە بەرچاو:

ـ لە ڕووی زمانییەوە نوکتە بە واتای ئەو مەسەلە وردە دێت، کە لە گۆشەنیگایەکی وردو فیکرێکی قووڵ و ئامانجێکی دیاریکراوەوە درووست دەکرێ.





ـ جان فوراستی پێی وایە: نوکتە هۆکارێکە بۆ گوتن و بیرکردنەوەو تەواسوڵ، دیاردەیێکی سایکۆلۆجی و سۆسیۆلۆجییە.

سولی دەڵێت: هۆکارێکی خەباتی کۆمەڵایەتییە، سەبارەت بە هەژارو چەوساوەکان بە گشتی و ژن و منداڵ و زەحمەتکێشانیش بە شێوەیێکی تایبەتی، ئامرازێکیە بۆ وەدەستخستنەوەی پێگەو نرخی تایبەتی خۆیان.

## کۆنترین نوکتە

ڕۆژنامەی (لیبراسۆن)ی فرەنسی ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەیێکی زانکۆی (وولویرامبتۆن)ی بریتانیی بڵاوکردبۆوە، کە لە بارەی مێژووی سەرهەڵدانی نوکتەوە ئەنجامدراوە، بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەیە: نوکتە بۆ یەکەمجار لە لایەن فیرعەونەکانی میسر و سۆمەرییەکانی باشووری عێراق بەرهەم هێنراوە، کۆنترین نوکتە تەمەنی (3900) ساڵە، ئەوەش ئەو کاتە دروستبوو، کە سۆمەرییەکان بۆ گوزارشتکردن لەو ئازارانەیان کە لە دەست ژنەکانیان تووشیان دەبوو، پەنایان بردە بەر نوکتە. دکتۆر (پۆل ماکدۆنالد) مامۆستای زانکۆی ناوبراو ئەوەشی گوت: نوکتە بە پێی کات و شوێنەکان گۆڕانی بەسەردا دێت، جارێکیان شێوەی مەتەڵ و جارێکی دیکەش شێوەی گاڵتەو گەپ وەردەگرێت، هەروەها ئەوەشی زیادکرد، کە: مەبەست لە نوکتە هەر لەو ڕۆژەی درووستکراوە تا ئەمڕۆ گوزارشت کردن لە بابەتە قەدەغەکراوەکانە، بەڵام لە ڕێگەی گاڵتەوگەپەوە، کە بەمە نوکتە دەتوانێ باسی ئەو بابەتەش بکات و خۆی لە سزای یاساش بدزێتەوە.

## ڕووخساری نوکتە

نوکتە بە شێوەیەکی گشتی لە چەند فۆڕمێك دەردەکەوێت، لەوانە گرنگترینیان:

1ـ لە شێوەی حەکایەتێکی کورت.. بۆ نمونە:

دوو سێ قوتابی لەگەڵ مامۆستاکەیان دەیاننووسی، کە وانەکە تەواوبوو و مامۆستا تەختە ڕەشەکەی سڕیەوە، ئەوانیش دەفتەرەکانی خۆیان سڕیەوە!!

2ـ لە شێوەی گتوگۆیێکی کورت.. بۆ نمونە:

یەکەم: ئەرێ بە ڕای تۆ تەلەفزیۆن خەڵك ڕۆشنبیر دەکات؟!

دووەم: ئەی چۆن؟

یەکەم: بەڵگەت چییە؟

دووەم: بەڵگەم ئەوەیە، هەر کاتێك منداڵ تەلەفزیۆن بکەنەوە، من دەچمە ژوورەکەی تر بۆ خۆم دەخوێنمەوە!!!

## شەشەم: مەتەڵ

کۆمەڵێك ڕستەو پەڕەگرافی پرسیار ئامێزن، بە ڕەمز باس لە شتێك دەکەن، دواتر دەپرسن: ئەو شتە چییە؟ ئەوەش لە کۆنداو ئێستاش گرنگی تایبەتی هەبووەو هەیە، جاری وا هەبووە بە تایبەت لە کۆندا کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن نەبوونە، ئەو مەتەڵانە بوونەتە مایەی بەسەربردنی کات و، ئەوەی هەڵیهێنابن، ئەوا بە بیرتیژ و زیرەك ناسراوە.. لەو مەتەڵانە:

أـ ئەمە چییە؟ ئەملا دیوار ئەو لا دیوار، تیایدایە سەگێکی هار؟ وەڵام: (زمان)ە کە لەنێو (دەم)دایە.

ب ـ بە پڕی نیوەیەو بە نیوەیی پڕە؟ وەڵام: (مانگ)ە





## حەوتەم: گۆرانی

ئەمانە (شیعر)ن، لە فۆلکلۆردا پێیان دەگوترێت (گۆرانی) چونکە لە کۆندا نووسین نەبووە شاعیرەکە وەکو گۆرانی پێشکەشی کردوون، بەڵام لە سەردەمی نوێ پێی دەگوترێت شیعر، چونکە شاعیر شیعرەکە دەنووسێت، لە پاشان گۆرانیبێژێك دێت شیعرەکە دەکاتە گۆرانی.

گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان بواریان زۆرەو هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆن بە گوێرەی سەردەمەکان دەگرێتەوە، دەشێت سیاسی بن، یان ئایینی، یان کۆمەڵایەتی، یان وەسفی سروشت و، ...هتد.

## ئەدەبیاتی هونەری بەرز

### یەکەم: شیعر

یەك لە دوو شێوەکانی دەربڕینی ئەدەبییە، خەیاڵ و سۆز و بیر لە داڕشتنیدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینن، مێژووی سەرهەڵدانی بۆ ڕۆژگاری بەر لە نووسین دەگەڕێتەوە، ئەو ڕۆژەوەی ئادەمیزاد بیری لەوە کردەوە، گوتەو دەربڕینەکانی ڕێك و کێشراو بن، قالبدار و قیاسی بن، ئیتر لەو ڕۆژەوە شیعر پەیدا بوو، تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ، بەشێکی گەورەی ئەدەبیاتی هەموو میللەتانی دونیا هەر بە شیعر دەنووسرێتەوە.. شیعر فۆرم و جۆری زۆری هەیە، لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێکیان، لەوانەی کە لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەن.

### جۆرەکانی شیعری کوردی

لە ڕووی ڕووخسارەوە شیعری نووسراوی کوردی، ئەم جۆرانەی هەیە:

### یەکەم: بەیتی یەتیم

بەیتی یەتیم، یان تاکە دێڕ، یان دێڕی موفرەد، ئەو تەنیا دێڕەیە، کە شاعیر بە تەنیا دایناوە، چ بەیتێکی دیکەی لەگەڵ نییە، لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیدا لەم جۆرە بەیتانە زۆرن، بۆ نمونە:

ـ مەنزڵی مەئمەن نەماوە ئێستەکە ئەییامەکە
ڕاحەتی مومکین نییە، نەچیە مەدینە، یان مەکە... (حاجی قادری کۆیی)
ـ گەر ڕەفیقت یاری صادق بێ چ باکی ڕێگەتە
گەر کەسی بەدخوت لەگەڵدا بێ، جەهەننەم جێگەتە... (جەنەڕال ئەمین فەیزی بەگ).





### دووەم: دوو بەیت

بریتییە لەو شیعرەی، کە تەنیا لە دوو بەیت داڕێژراوە، واتای تەواویش بە دەستەوە دەدات، دێڕی یەکەم هەردوو نیوە دێڕەکانی بە پیتێك قافیەدار کراون و دێڕی دووەمیش نیوەدێڕی یەکەمی جیایە، بەڵام نیوەدێڕی دووەمی هەمان قافیەی نیوە دێڕەکانی پێشووی هەیە، بابا تاهیری هەمەدانی شیعرەکانی وەها نووسیون:

مەگەر شێر و پلنگی ئەی دل ئەی دل
بە مو دائیم بە جەنگی ئەی دل ئەی دل
ئەگەر دەستم ڕەسەد خوینت بریجم
بوینم تا چ ڕەنگی ئەی دل ئەی دل

شیاوی باسە هەندێ جار بە هەڵە بەم دوو بەیتیانەی بابا تاهیر دەگوترێت چوارینەکانی بابا تاهیر، چونکە چوارین قافیەی لە قافیەی دوو بەیت جیایە.

### سێیەم: پارچە

ئەو شیعرە لەسەر قافیەی غەزەل و قەسیدە دەنووسرێت، بەڵام ژمارەی دێڕەکانی لەوان کەمترە، لە نێوان سێ تا شەش دێڕ دایە، لە ڕووی واتاشەوە واتای تەواو بە دەست دەدات.. نمونەی وەها لە دیوانەکانی شیعری کلاسیزم بەرچاو دەکەون.

### چوارەم: غەزەل

شیعرێکە لەسەر کێشی عەروزی دەنووسرێ و پارێزگاری لە یەك سەروا ئەکات، ژمارەی بەیتەکانی لە نێوان حەوت تا پانزە بەیتە، دەشێ یەك دوو بەیتیش لەوە زیاتر، یان کەمتر بێت. ناوەڕۆکەکەی لە بنجدا تایبەتە بە خۆشەویستی خوداو

ستایشی ئایینی، بەڵام دواتر وەصفی ژن و دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی بۆ ژن و زۆربەی بابەتەکانی پیاهەڵدان و شانازی و داشۆرین و سۆزی نیشتمانی و نەتەوەیی و هی دیکەشی پێ نووسراوە.. لەسەر ئەو بنەمایە، وایلێهاتووە غەزەل زیاتر لە جۆرێکی ببێ، لەوانە: غەزەلی ئایینی و غەزەلی عەفیف و غەزەلی ماجین و غەزەلی موزەککەرو ...هتد. بەڵام لێرەدا دەبێ ئاگاداری دوو شت ببین.

یەك: وشەی غەزەل ڕاستە بە واتای خۆشەویستی و دڵداری دێت، بەڵام ئەم ناوە درەنگ بۆ ئەو فۆرمە شیعرییە دانراوە، واتە مێژووی ناوەکە زۆر تازەترە لە مێژووی بەرهەمهێنانی شیعرەکە لە لای ئادەمیزاد.

دوو: کە غەزەل بۆ ناوی ئەمجۆرە شیعرە دادەنێین، ئەمە تەنیا بۆ پۆلێنکردنە، وەکو زاراوە بەکاری دێنین و چ پەیوەندییەکی بە واتا وشەییەکەی ناهێڵین، کە وەکو گوتمان خۆشەویستی و دڵدارییە، بەڵام ئاساییە چەند جۆرێکی غەزەل بۆ ژن و بۆ مەبەستی خۆشەویستی ژن و دڵداری بنووسرێت.

کەواتە غەزەل وەکو بابەت: جۆرێکە لە جۆرەکانی شیعری گۆرانی (غنائی)، وێنەی لایەنی سۆزی مرۆیی بەرجەستە دەکات، بە خۆشەویستیدا هەڵدەدات، جا ئەو خۆشەویستییە خودایی بێ، یان مرۆیی. بەڵام غەزەل وەکو ناوی هونەرێك لە هونەرەکانی نووسین: بریتییە لە قالبێکی دیاریکراوی شیعر، لە کوردیدا بە کێش و سەروای یەکگرتوو دەنووسرێت.

ئەم هونەرە وەکو فۆرمێکی تری نووسین، لە لای عەرەبەکان لە سەردەمی جاهیلیدا سەریهەڵداوە، عەنتەرەی کوڕی شەداد و عورووەی کوڕی حەزام لە دیارترین شاعیرانی غەزەلیاتی عەرەبی جاهیلی بوون.. لە لای فارسەکانیش لە سەدەی شەشی هیجری لەسەر دەستی (ئەبولمەجد مەجدود ئیبنو ئادەم)ی ناسراو بە (سەنائی) سەریهەڵدا، کە ئەو قۆناغە لە ئەدەبی فارسی بە قۆناغی شیعری





پیاهەڵدان دەناسرێت، لە ئەدەبی کوردیشدا لە سەدەی دەی هیجری لەسەر دەستی مەلای جزیری دێتە داهێنان.. وەکو گوتمان غەزەل زیاتر لە جۆرێکی هەیە، هەندێ لەمانە:

أ ـ غەزەلی ئایینی

ئەو غەزەلەیە کە بۆ ستایشی خواو پیشاندانی دەسەڵات و گەورەیی و سیفاتە جوانەکانی خودا و کەس و شتە خۆشەویستەکانی خوداو ئایینەکەی دەنووسرێ، بە گوێرەی قسەی لێکۆڵەران لە بواری ئەدەبدا لەوەتەی ئادەمیزاد هەیە، حەفتا لە سەدی بەرهەمە فیکری و ئەدەبییەکانی بۆ ئەم بوارەی خوداناسییە، ئەوەی تری سەدا بیستی بۆ خۆشەویستی ژن و ئینجا ئەوەکەی تریش بۆ پرسە هەنووکەییەکانی هەر کۆمەڵ و نەتەوەو کێشە مرۆییەکانی دیکە دەنووسرێت، ئەمە چونکە ئادەمیزاد کە بە ئەقڵ بیردەکاتەوە، هەمیشە خوداو بەندایەتیکردنی باش و بەهەشت و پاداشتەگەورەکانی خودای بیردێتەوە، کە بە سۆزیش ڕۆدەچێ، بیر لە هاوسەری ژیانی دەکاتەوە، ئیتر بەم شێوەیە زۆربەی ئەدەب بۆ یەکەم و لەو کەمتر بۆ دووەم و لەویش زۆر کەمتر بۆ شتە هەنووکەییەکان دەنووسرێت.

لە ئەدەبی کوردیدا وەکو ئەدەبی زۆربەی میللەتانی تر غەزەلی ئایینی زۆر جوان هەیەو گوزارشت لە بڕوای ڕاستەقینەو دڵسۆزی خاوەنەکانیان دەکەن بۆ خودای خۆیان و بۆ ئایین و پێغەمبەرەکەیان.. حاجی قادری کۆیی دەڵێت:

مەعلومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەتحی باری

ب ـ غەزەلی دڵداری

جۆرێکی غەزەلە، بۆ ئافرەت و خۆشەویستی ئافرەت دەنووسرێت، شێوازی دەربڕینی لە وەسفدا جۆراو جۆرە، هەر یەکەو بە شێوەیێك باس لە دوڵبەرەکەی دەکات.. نالی دەڵێت:

پێم دەڵێن مەحبوبە خێل و خیچە مەیلی شەڕ دەکا

خێل و خیچە یان تەرازووی نازی نەختیٚ سەر ئەکا

## پێنجەم: قەسیدە

شیعرێکی درێژە لەسەر کێشی عەروزی دەنووسرێت، ژمارەی بەیتەکانی لە پانزەو بەرەو سەروو دایە، بابەتەکانی زۆرجار لە بابەتی غەزەل جیایە، بۆ ئایین و بۆ مەسەلە گرنگەکان دەنووسرێت.. لە گرنگترینی قەسیدەکانی شیعری کلاسیزمی کوردی، قەسیدەی (ئەلا ئەی نەفسی بوم ئاسا)ی (نالی) شاعیر و قەسیدەی (گوتم بە بەختی خەوالوو)ی (حاجی قادری کۆیی) و زۆرێکی دیکەی شیعری کلاسیزمە.

## شەشەم: مەسنەوی

هۆنراوەیێکی درێژە، پارێزگاری لە یەك سەروایی (یەك قافیە)یی ناکات و هەر بەیتێکی قافیەیێکی سەربەخۆی هەیە، واتە: هەردوو نیوە دێڕەکانی هەر دێڕێکی یەك قافیەیان هەیە.

ئەم فۆڕمە لەبەر ئەوەی ئازادی زۆر دەدات بە شاعیر بۆ ئەوەی بە ئاسانی بەرهەمەکەی چەندی بیەوێت درێژبکاتەوە، لە بنجدا داستانی پیٚ نووسراوەتەوە، وەکو داستانەکانی (مەم و زین) و (دمدمنامە) و (یوسف و زولێخا) و ئەمانە، بەڵام دواتر حاجی قادری کۆیی، بۆ زۆرێکی غەزەل و قەسیدەکانی خۆی هاتە سەر ئەم سیستمی قافیەی گۆڕاوە.. لە داستانی (دمدمنامە)دا هاتووە:





ـ محەمەد وتەی بیٚ درۆ و هەقە

درۆزن گەلی کافری سەر ڕەقە

خوداوەند دەیدایە پایەو مەقام

دەگەل وی دووا شەو بە شیرین کەلام

ئەوی کردە سەرداری پێغەمبەران

لە بۆ وی نەرم بوو سەری سەروەران

لە تۆ بی هەموو دەم سەلات و سەلام

لە لایەن خودا ئەی نەبی وەسسەلام... داستانی (دمدمنامە)

دەبینین هەر دێڕێکی ئەم پارچە داستانەی سەروو، قافیەیێکی تایبەتی هەیەو دێڕەکەی دواتر قافیەی گۆڕیوە.

## حەوتەم: چوارین

ئەو هۆنراوەیە، کە لە چوار لەتە دێڕی شیعر پێك دێت، لەتی یەکەم و دووەم و سێیەمی بە زۆری یەك قافیەیان هەیەو لەتی چوارەمیش قافیەی لەوانەی پێشوو جودا دەبێتەوە، بۆ نمونە:

ـ ڕۆڵەکەم ژیر و وشیار بە

خوێندەوار و هونەرکار بە

هەردەم بۆ چاکە تەیار بە

هەر ئەوەت باشەو بەسوود... مەلا عەبدی

## هەشتەم: چوارخشتەکی

ئەو هۆنراوە درێژەیە، کە لە ژمارەیەك چوارینی بە دوای یەکدا هاتوو پێك دێت، هەر چوارینەی لە ڕووی واتاوە تەواوکەری واتای دێڕەکەی پێشە خۆیەتی.. بۆ نمونە:

ـ ئەی عێراقی بێکەس و دڵ پڕ لە ئێش و دەردو غەم
وەی ئەسیری حەربی ناڕێکی لە مەیدانی بە تەم
حەیفە پاشی تۆ بمێنن کوردەکانی بێ حەشەم
چوو لە دەستیان مەعدەنی عیززو شەڕەف بەینەلکەڕەم
تا لە چوارینی حەفتەم و کۆتاییدا دەڵێت:
ـ چاکە فکرێکەن لە ئیستیقبالی خۆ زوو چارەکەن
تەرکی وەحشەت کەن سیلاحی یەکدی کوشتن پارە کەن
ڕوو لە پەیداکردنی ئالاتی وەك تەییارە کەن
تاوەکو دەشتی نەبێ مەشغولی قال و قیلی خەم... (دەشتی).

### نۆیەم: پێنجین

فۆڕمێکی شیعری کلاسیزمی باوە، تەنیا لە نێو ئەدەبی نەتەوە موسڵمانەکاندا نەماوەتەوە، بەڵکو چووەتە ناو ئەدەبی نەتەوە ناموسڵمانەکانیش لەو دیو قەفقاس، بریتییە لە پارچە شیعرێك لەسەر کێشی عەرووزی دەبێت و بەسەر چەند بەندێك یان برگەیێك (کۆپلەیەك) دابەشکراوە، هەر بەندی بریتییە لە پێنج نیوە دێڕ شیعر، هەموو نیوە دێڕەکان لە بەندی یەکەمدا لەسەر یەك قافییە دەبن، کە ئەمە قافیەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە شیعرەکەیە، نیوەدێڕی پێنجەمیش لە هەموو بەندەکاندا لەسەر قافیەی بەندی یەکەم دەبێ، بەم جۆرە:
أ أ أ أ أ.. ب ب ب ب أ.. ت ت ت ت أ..هتد.

پێنجین) وەکو فۆڕمێکی نوێ لای شاعیرانی موکریان هاتە نێو شیعری کوردی و لە شیعرەکانی (ئەدەب ـ میصباح الدیوان ـ) و (ئەدیب) و..هتد سەریهەڵدا.





یەك لە (پێنجین)ە هەر گرنگەکانی (ئەدەب) (دووی شەو شەوی شەنبە)یە، لەو شیعرەدا دەڵێت:

دوی شەو شەوی شەنبە کە لە شەمع و مەوا ئەختەر
ئاراستە بوو سەتحی سەرا پەردەی ئەخزەڕ
من بەندە لە کاشانەیی تاریك و موحەققەر
دوو دیدەیی عیبرەت بە براو سەقفی موجەددەر
گەه غەرقی خەیالات و گەهی والەو موزتەڕ

### دەیەم: پێنجخشتەکی

بریتییە لەو شیعرەی لە چەند کۆپلەیەکی پێنج نیوەدێڕی پێکدێت، بناغەی هەریەکە لەو (پێنجخشتەکی)یانە دێڕە شیعرێکی شاعیرێکی ترە، دەشێت کوردی بێت، هەروەها دەشێت عەرەبی یان فارسی و تورکیش بێت، چونکە شاعیرانی کلاسیزم زۆرجار هاتوونە هۆنراوەیەکی شاعیرێکیان وەرگرتووە، کە زۆر پێی کارتێکراو بوونەو هەر دێڕێکی هۆنراوەکەیان کردۆتە بناغە بۆ (پێنجخشتەکی)یەکیان، وەکو (مەلای جزیری) لە شیعری (من دبەر ـ قالوا بلی ـ) هۆنراوەیەکی (جەلالەدین) ناوێکی هێناوە، لەسەر بنەمای ئەو پێنجخشتەکیەکی درووستکردووە، بۆ ئەم بارەش لە ئەدەبی کوردیدا زاراوەو ڕستەیەکی تایبەت بەکار دەهێنرێت، بۆ نمونە دەگوترێت: پێنجخشتەکی (جزیری) لەسەر شیعری (جەلالەدین).. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە وەکو گوتمان: (مەلای جزیری) شیعرێکی (جەلالەدین)ی دەستنیشانکردووەو هاتووە لەسەر بنەمای ئەو (پێنجخشتەکی)یەکی نووسیوە، واتە (جزیری) شیعرەکەی (جەلالەدین)ی

(تەخمیس) کردووە، بەم جۆرە.. پێنجخشتەکی: ئەو شیعرەیە کە دوو شاعیر لە دانانی بەشدارن:

لە یەك لە (پێنجخشتەکی)یەکانیدا (مەلای جزیری) دەڵێت:

نا ئێتن گوتن ب قال، شەرح و بەیانا حوسنێ تو
دێ ب حال و سر بناسین دل فەسانا حوسنێ تو
خوەش مەلا ئامانجێ تیران کر کەمانا حوسنێ تو
قسەیی عیشق جلال و داستان حوسن تو
**تلك أنباء يقول الناس منا بعد حين.**

لەم پێنجخشتەکییەدا سێ نیوە دێڕەکەی یەکەم هی (جزیری) و دوو نیوە دێڕەکەی چوارەم و پێنجەم هی (جەلالەدین)ن، بەمەش (پێنجخشتەکی)یەکە هۆنراوەتەوە.

کەواتە: (پێنجخشتەکی) ئەو شیعرە تێکەڵەیە، کە هەر کۆپلەیەکی سێ نیوە دێڕی یەکەمی هی شاعیرە تازەکەو دوو نیوە دێڕی کۆتاییشی هی شاعیرێکە، کە شاعیرە تازەکە وەریگرتووە، بەڵام (پێنجین) ئەو شیعرەیە، کە لە چەند کۆپلەیەکی پێنج نیوە دێڕی پێکدێت، بەڵام هەر پێنج نیوەدێڕەکان هی خودی شاعیرەکە خۆینەو هیچی لە کەس وەرنەگرتووە.

## یازدە: شیعری خۆماڵی

بریتییە لەوجۆرە شیعرییە ستوونییەی، لەسەر کێشی پەنجە دەنووسرێت و پارێزگاری لە سەروا دەکات، کێشەکەی بە زۆری (10) برگەیی و (8) برگەیی و (7) برگەیی و (5) برگەیی و هی دیکەیە، (سەروا)کەشی بە زۆری سەروای گۆڕدراوە (سەروای مەسنەوی).





دیارە ئەمەش نوێیەکی کۆنە، (نوێ)یە لەبەرئەوەی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، گوزارشت لە واقیع و پێویستی و هەر شتێکی دیکەی نوێ دەکات، (کۆن)یشە لەبەر ئەوەی ئەو فۆڕمە چ (کێش) و چ (سەروا)کەشی هی فۆلکلۆرە، کلتورێکی گەورەی شیعری فۆلکلۆر و میللی هەر لە زووەوە پێ نووسراوەتەوە، بەڵام دوای ئەوەی بۆ سێ چوار سەدە شوعەرای کورد چوونە نێو سیستمی عەروزی و فۆڕمە کلاسیکەکانی (غەزەل) و (قەسیدە)و (داستان)یان لەسەر کێشی بەحرە عەروزیەکان نووسیەوە، ئیتر وازیان لەو کێشی پەنجەیە هێنا، بەڵام دوای نوێبوونەوەی ئەدەبی کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، شاعیرانی نوێی کورد دیسان گەڕانەوە سەر ئەو کێشە کۆنەی فۆلکلۆر و بەشێکی گرنگی شیعرە نوێکانیان پێ نووسیەوە.

کێشی پەنجە یان کێشی (سیلاب)، لە ڕاستیدا کێشی فۆلکلۆرە، واتا کێشی شیعری کۆنی تەواوی میللەتە کۆن و خاوەن فۆلکلۆرەکانە، بە تەنیا موڵکی چ تاکە نەتەوەیەك نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو نەتەویەکیش سوودی لێ وەرگرتووە، کوردیش یەکێکە لەو میللەتانەی بەشێکی گەورەی شیعری خۆی چ لە فۆلکلۆر و چ لە میللی و چ لە قۆناغی نوێشدا پێ نووسیوەتەوە. ئەمەی خوارەوە چەند نمونەیەکە لە شیعری خۆماڵی:

1ـ کێشی (10) برگەیی:

ـ ئەڵڵاهو ئەکبەر مەلا بانگدانە    تاریك و لێڵی بەری بەیانە
مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو    زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو
ئەستێرەی مەغریب وەك قەترەی ئەمەل    کز کز ئەتکێتە ناو بەفری سەر کەل... گۆران.

2ـ کێشی (8) برگەیی:

ـ لە ژێر زەردەی خۆرەتاودا    بەناو چیمەنی گوێ ئاودا

چەن بە ئاهەنگ چەن سیحراوی    ئەگەڕێ قاز، یان مراوی
یا کەو لەسەر بەفری نزار    بۆ لوتکەی هەزار بە هەزار... گۆران.

3ـ کێشی (7) برگەیی:

ـ کەوی جوانی کوردستان    نازدارەکەی هەموومان
خرپنی خال و مل ڕەش    دەنووکی سوورو چاوگەش
ئالودەی چیای کوردستان    بێشەڵان و کوێستان... نوری وەشتی.

4ـ کێشی (6) برگەیی:

ـ ژان چییەو زیان چی    بەزەیی و ویجدان چی
ئەوەندە ئەزانم    دوژمنی ئینسانم
درەنگ زوو ڕۆژێك دێ    کام ئینسان لە کام جێ
قۆندەرەی بمگاتێ    حەقی خۆم ئەداتێ... گۆران.

5ـ کێشی (5) برگەیی:

ـ ئەم نیشتوومانە    هی هەموومانە
ماڵێ پیرۆزی    یەك بە یەكمانە
دەبێتن ئێمەش    زۆرمان خۆش بووێ
خزمەتی بکەین    بە ڕۆژ و شەوێ... ئیدریس عەبدوڵڵا.

## دووەم: پەخشان

پەخشان یەکێکە لە دوو شێوەکانی نووسین، ئاسان نییە بە شێوەیەکی بێگومان ئەوەمان بۆ ڕوونبێتەوە، کە ئایا سەرەتا پەنا بۆ ئەم براوە یان بۆ شیعر، بۆیە نووسەرانیش لەم ڕووەوە ڕای جیاوازیان هەیە، لەوانە:





ـ دەستەیەك پێیان وایە شیعر پێش پەخشان پەنای بۆ براوە.. ئەمانەی ئەو ڕایە دەردەبڕن، پاساویان ئەوەیە، کە (ئەدەبی هۆنراوە لە ویژدانەوە سەرهەڵئەدات، هی پەخشان لە ئەقڵەوە پەیدا ئەبێ، ویژدانیش لە پێش ژیرییەوە پەیدا بووەو ئەبێ، چونکە ئادەمیزاد لە پێشا هەست بە ویژدان ئەکا، پاشان بیرو هۆشی بۆ دروست ئەبێ و، لەسەر ئەم بناغەیە هۆشی ئەخاتە کار، لەسەر ئەمە ئەبێ لە پێشدا هۆنراو بووبێت، پاشان پەخشان هاتبێتە ئاراوە).

ـ هەرچی دەستەی دووەمە، ئەمانە پێیان وایە پەخشان بەر لە شیعر پەنای بۆ براوە، هەروەکو خاوەنی (**نظرية الأنواع الأدبية**) دەڵێت: (بە پێچەوانەی ئەوەی خەڵکی وا گومان ئەبەن، کە شیعر بەر لە پەخشان گەشەی کردبێت، ڕای دروستتر ئەوەیە، کە پەخشان بە قەد کۆنی جیهان کۆنە.

## بەشەکانی پەخشان

پەخشان دوو بەشی سەرەکیی هەیە، ئەوانیش:

### 1ـ پەخشانی زانستی:

پەخشانی زانستی ئەو پەخشانەیە، کە زانستە جۆراوجۆرەکانی وەکو: کیمیا، فیزیا، ماتماتیك، زمان، پرنسیپەکانی ئایین، یاسا، مێژوو، جوگرافیا، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، ڕۆژنامەگەری، ئەندازە، کشتوکاڵ و...هتدی پێدەنووسرێت.

### گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە پەخشانە:

1ـ ڕەگەزەکانی سۆز و خەیاڵ لە دارشتنیدا ڕۆڵ نابینن.

2ــ بە زمانێك دەنووسرێت دوورە لەوەی خوێندنەوەی جیا هەڵبگرێت و، بە شێوەیەکی گشتی سەرکەوتنی نووسەرەکەی لەوەدایە، کە باسەکەی یەکجۆر واتا هەڵبگرێت.

3ــ کورتی و درێژی ئەمجۆرە پەخشانە بەستراوەتەوە بە کورتی و درێژی بابەتەکانی، نووسەر تیایدا ئەو ئازادییەی نییە خەیاڵبازی بکات و، شتی لابەلای تێکەڵ بکات، یان شتانێکی لێ کەم بکاتەوە، کە وا بزانێت بابەتەکەی بەوە کاریگەری زیاتری دەبێت، وەك چۆن پەخشاننوسی ئەدەبی بە گوێرەی خەیاڵ و تواناو سەلێقەی خۆی سڵ لەوە ناکاتەوە، یان بە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین: لە پەخشانی زانستیدا بابەتەکە خۆی خۆی فەرز دەکات و، ڕۆڵی نووسەرەکەی زۆر تێدا دەرناکەوێت، بەڵام لە پەخشانی ئەدەبیدا داهێنراوی بیری نووسەرەکە سنور بۆ درێژی و کورتی و شێوە دارشتنە پڕ سۆزو خەیاڵ و کاریگەریەکەی دەستنیشان دەکات.

4ـ زمانی پەخشانی زانستی مەرج نییە، سەرجەم وشەکانی نەتەوەیی پەتی بن، چونکە جۆری بابەت، یان زانستەکە نووسەرەکەی ناچار دەکات، وشەی دیکەی بێگانە بخاتە نێو بابەتەکەی، ئەوەش چونکە زۆربەی زانستەکان لە دۆزینەوەی میللەتانی ترن، بۆیە زاراوەی پێویست بۆ ئەو زانستەیان بە زمانی خۆیان داناوە، جا کاتێك نووسەری زمانێکی تر دەیەوێت، ئەو زانستە نوێیە بخاتە خزمەت میللەتەکەی خۆی، ناچارە بە هەمان ئەو زاراوانەی زمانی زانستەکە، زانستەکە بگوازتەوە سەر زمانی میللەتەکەی خۆی، نمونەی ئەوەش زاراوەکانی پزیشکییە، کە وەکو دەبینین زۆربەی زاراوەو ناوی نەخۆشی و ناوی دەرمانەکانی ئینگلیزییە، وەکو وشەکانی: (پاڕاسیتۆل ـ نۆڤاڵجین ـ فلۆ ئاوت ـ ئەمپیسیلین) و، دەیان و سەدان وشەی تر، کە ڕۆژانە قوتابیانی خوێندنی پزیشکی و نەخۆشەکان دەیبیسن.. هەروەها زاراوە





ئایینیەکانە، وەکو زاراوەکانی : (زەکات ـ حەج ـ دەعوە ـ جیهاد ـ عەبد ـ ڕەحم ـ صەبر ـ شیقاق ـ جەهەننەم ـ جەننەت) و...هتد.

لەبەر هەموو ئەوەش پەخشانی زانستی بە ئەدەب دانانرێت، بۆیە ئێمەش لەم کورتە باسەماندا بە تەنیا تیشك دەخەینە سەر پەخشانی ئەدەبی.

## 2ـ پەخشانی ئەدەبی:

ئەو پەخشانەیە کە بە شێوەیەکی ئەدەبی بەرز و، بە داهێنانی گەروە دەنووسرێت، فۆڕمی جۆراو جۆری هەیە.

## گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پەخشانی ئەدەبی:

1ـ وشەکانی ناسك و سەرنجڕاکێشن.

2ـ نووسەر دەوری سەرەکی دەبینێت لە بەهێزو کاریگەر دارشتنی بابەتەکەی.

3ـ زمانی نووسینی زمانێکی نەتەوەیی پەتییەو، پاکە لە وشەی بێگانە.

4ـ ڕەگەزەکانی خەیاڵ و سۆز دەوری سەرەکی دەبینن، لە دارشتنیدا.

5ـ ڕەمز تێیدا بە گوێرەی پێویست و توانای نووسەرەکە بەکاردەهێنرێت.

## ـ جۆرەکانی پەخشانی ئەدەبی:

پەخشانی ئەدەبی گەلێ فۆڕمی جۆراوجۆری هەیە، لەوانە هەیانە زۆر کۆنن و، هەشیانە نوێ و نوێترن، لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر گرنگترینیان، کە بریتینە لە:

### 1ـ وتار:

وتار: پارچەیەك پەخشانی ئەدەبییە، بابەتێکی تایبەتی نووسەرەکەی چارەسەر دەکات، لەوەی کە ئەنجامی داوە، یان هاتۆتە بیری، یان وای بۆچووە، یان دایهێناوە.

ناونیشانی وتار دەبێت سەرنجڕاکێش بێت، ڕەگەزەکانیشی بریتینە لە: پێشەکییەك وەك ڕێگەخۆشکردن بۆ چوونە ناو باسەکە، ئینجا وردە وردە بیرەکە دەخرێتە ڕوو، تا لە کۆتاییدا ئەوەی نووسەر مەبەستیەتی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ دەیگەیێنێتە بیری خوێنەر.

یەکەم داهێنەری ئەم فۆڕمە (مۆنتیبی)ی ئەدیبی فرەنسییە، لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدە، کە ئەو وەکو تەنیا هەوڵێك ئەمەی کرد، بەڵام بە زوویی لە لایەن نووسەران قۆزترایەوە، بە فراوانی بابەتەکانیان پێ نووسی، ئەوەی زیاتریش یارمەتی فراوانبوونی دا، ڕۆژنامە بوو، کە لە ئەدەبی کوردیشمان، یەکەم وتاری هونەری لە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی (میقداد مەدحەت بەدرخان) لە ساڵی 1898 نووسرا.

### 2ـ چیرۆك:

لە ڕووی ناواخنەوە دوو جۆر چیرۆك هەیە، ئەوانیش (چیرۆکی واقیعی و، چیرۆکی خەیاڵی)نە، لە (چیرۆکی واقیعی) دا: (هەموو ڕووداوێکی ژیانی کۆمەڵایەتی دەشێت ببێتە بابەتێکی ئەمجۆرە چیرۆکە).

بەڵام هەرچی (چیرۆکی خەیاڵی)یە، ئەوا: ڕووداوەکانی ئەمجۆرە چیرۆکە لە سەربردەکانی سەرووی توانای مرۆڤ (خوارق)ەکان وەردەگیرێت، لەوانەی کەوا خەڵکان حەز دەکەن، بۆ پاڵەوانەکانیان لە خەیاڵی خۆیاندا دروستی بکەن.





لێرەدا هیچ ڕاستییەك نییە لە نێوان واقیعی پاڵەوان و، ئەو وێنەیەی چیرۆکەکە بۆی دەکێشێت).

### ـ جۆرەکانی چیرۆك لە ڕووی فۆڕمەوە

لە ڕووی فۆڕمەوەش چیرۆك چەند جۆرێکە، لەوانە:

أ ـ چیرۆکی درێژ (نۆڤلێت)

ئەمە فۆڕمێکی هونەری چیرۆکە، لە ڕۆمان کورتترەو لە کورتە چیرۆك درێژترە، دەشێت لاپەڕەکانی لە نێوان پازدە یان بیست سی لاپەڕەیەك دابن، کەسایەتی و ڕووداوەکانی لە هی کورتە چیرۆك زۆرتر و، لە هی ڕۆمانیش کەمترە، بۆیە بە لای هەندێ کەسەوە ئەمە بە (کورتە ڕۆمان)یش ناوزەد دەکرێت، بەڵام هەندێك پێیان وایە لەبەر کەمی ڕووداو و پاڵەوانەکانی، چیرۆك چەندەی درێژیش بێت، نە بە ڕۆمان و نە بە کورتە ڕۆمانیش دانانرێت.

ب ـ کورتە چیرۆك

فۆڕمێکی هونەری هاوچەرخە، لەگەڵ سەدەی ڕۆژنامەگەری و خێرایی و مەیلکردن بەلای وردبوونەوە لە شتەکان دەگونجێت، یەك ڕووداو لەخۆ دەگرێت، کەسێتیەکانی لە سێ یان چوار تێناپەڕن و، هەندێجاریش تەنیا یەك کەسە.

لە ڕاستیشدا هۆی سەرهەڵدانی بۆ تێڕوانینی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ کات، کە بە لای خەڵکانی نوێوە کات زۆر گرنگەو، مرۆڤی شار لە سای تەکنەلۆژیاو کاری دینامیکیانەی بەردەوام، ئەو کاتەی نییە وەکو جاران چەند شەوو ڕۆژێك تەرخان بکات، بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانێك یان داستانێکی درێژ، بەڵکو ئێستاکە کاتی مرۆڤەکان لەوانەیە تەنیا ئەوەندە بێت، کە لە ماڵ تا دەگەنە شوێنی کارکردنیان و، بیانەوێت لە نێو پاس یان میترۆ سوود لە خوێندنەوەی بەرهەمێك وەربگرن،

که ئەو ماوەیەش زۆر کورتە، بۆیە لێرەدا کورتە چیرۆك خۆی فەرز کرد، کە بە فراوانی بێتە مەیدان.

د ـ کورتیلە چیرۆك

فۆرمێکی دیکەی هونەری چیرۆکە، لە ڕووی دارشتن کورتترە لە کورتە چیرۆك.

### 3ـ ڕۆمان

ئەمە کۆنترینیانە، ڕۆژگاری سەرهەڵدانی بۆ سەردەمی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیەت دەگەڕێتەوە، دوای شۆڕشی فەرەنسی و کودەتاکردن بەسەر ڕژێمی پاشایی ئەوروپی، ئیتر بووە ژانرێکی هونەری نوێی چیرۆکی درێژو، بووە جێگرەوەی داستان.

ڕۆمان بە شێوەیەکی گشتی: هونەری گێڕانەوەی زیرەکانەیە، نە وەکو شیعر چڕەو، نە یەکیەتی بابەت و جەختکردنەوە لەسەریشی وەکو هی شانۆگەری وایە.. سەبارەت بە ڕووداویش، ڕۆمان ڕووداوی زۆرو جۆراوجۆر لە خۆی دەگرێت، کە لە نێوانیان پەیوەندیەکی ڕوون، یان نادیار هەیە، کەسێتیەکی سەرەکی و چەندین کەسێتی لاوەکیی هەیە، یانیش دەشێت چەندین پاڵەوانی هەبێت، بەڵکو دەشێت وێنەی شەقامێکمان بە هەموو کەسایەتی و ڕووداوو سەرەنجامەکانی بۆ بکێشێت، بەڵام هەرچەندەی ڕووداوو کەسێتیەکانیش زۆر بن، دەبێت هەر ئەو توانایەی بمێنێت، کە بتوانێت مانایەکی گشتی بدات بە دەستەوە، کە خوێنەر بە لێوردبوونەوەی، بتوانێت دەرك بەو واتا گشتیەی بکات.

### 4ـ کورتیلە پەخشان

پارچە سۆزێکی تایبەتە زیاتر لە بۆنەکان دەنووسرێت، جارانی تریش دەشێت بە هەر هۆیەك بۆ کەسی خۆشەویست بنووسرێت، جا کەسەکە کەسێکی تایبەت





بێت وەك دوڵبەر، یان دایك، یان دۆستێکی ئازیز، یانیش کەسایەتیەکی مەعنەوی بێت وەکو حزب یان وڵات یان دەوڵەت یان هەرشتێکی تری هاوشێوە، لێرەدا بابەتەکە هەمووی سۆز ئامێزەو خەیاڵیش دەوری باڵا لە دارشتنی دەبینێت.

لە ڕووی دارشتنەوە کورتەو، لە ڕووی وشەکانیش ناسك و، لە ڕووی کاریگەریشی سەرنجڕاکێشە.

### 5ـ نامە

بریتییە لە نامەی کەسی کە یەکێك بۆ ئەوی تری دەنووسێت، لە کۆنەوە لای پاشاو میرو میرزاکان پەنای بۆ براوە، لە دارشتنی هونەرکاری زۆر دەکرێت، وشەی ئەدەبی جوان و کاریگەرو سەرنجڕاکێش بەکاردەهێنرێت، لەگەڵ فراوانبوونی خوێندن و زۆربوونی خوێندەوارانیش دیارە فراوانتر لە جاران پەنای بۆ دەبرێت، بۆیە لە هەموو وڵات و شارو شارۆچکەکان فەرمانگەی پۆست دانراوە، کە بە داخەوە لە وڵاتی ئێمەدا تا ئێستا خزمەتگوزاری ئەو بوارە وەکو پێویست نییە.

### 6ـ ژیاننامە

ژیاننامە وەرگێڕانی ژیانی مرۆڤێکە لە میانەی خستنەڕووی وێنەیەکی ڕاستگۆو پڕشنگداری ژیانی خۆی. بەڵام دەشێت چۆنیەتی خستنەڕووی ژیانەکە لە لایەن خاوەنەکەی لای هەموو نووسەرێك وەکو یەك نەبێتن بۆ نمونە هەیە بە شێوازێکی نزیك لە ڕۆمانێکی هونەری دەیخاتە ڕوو و، لایەنی ئەدەبی بەسەردا زاڵە، نمونەی ئەمە (چێشتی مجێور)ی (هەژاری موکریانی)یە.. جاری واش هەیە بیرەوەریەکان زیاتر لایەنی خستنەڕووی بارە سیاسی تێداژیاوەکەی نووسەر بەرجەستە دەکەن، نمونەی ئەوەش (گەشتی ژیانم)ی (مەسعود محەمەد)ەو، بەم شێوەیە.

### 7ـ شانۆگەری

بریتییە لە: هونەری دووبارە دارِشتنەوەی رِووداوەکانی چیرۆك و، رِێکخستنەوەیان کردنیان بە وتووێژ (حوار) بۆ ئەوەی لەگەڵ شانۆدا بگونجێت و، بە ئاسانی بنوێنرێت.دیارە شانۆگەریش جۆری زۆری هەیە، لەوانە:

أــ شانۆگەری ئاسایی: ئەو شانۆگەرییەیە، کە رِووداوەکانی بە زمانی وشە دەنوێنرێن، کورتترین ماوەی سێ چارەگەو، دەکرێت تا دوو کاتژمێریش درێژ ببێتەوە.

ئەمجۆرەیان دەشێت لە پەردەیەکدا بێت، یانیش دەشێ لە چەندین پەردە ئینجا تەواو ببێت.

ب شانۆگەری بێدەنگ: ئەمە بەبێ بەکارهێنانی زمانی وشەو، بە هۆی زمانی هێماوە دەنوێنرێت، زۆرجار ئەمجۆرەیان (مۆنۆ دراما)شی پێدەگوترێت، چونکە تەنیا یەك کەس دەینوێنێت و، لێرەدا دەبێت توانای ئەکتەرەکە زۆر گەورە بێت، چونکە سەرجەم بیرۆکەکان بە رِەمز گوزارشت دەکات، هەروەها دیکۆریش لێرە گرنگی خۆی هەیەو، دەبێتە یاریدەدەرێکی باشی ئەکتەر بۆ سەرکەوتنی کارەکەی.

### 8ـ خوتبە

هونەرێکی قسەیی کاریگەرو گرنگە، بۆ پەیوەندیکردن بە جەماوەرو، کارتێکردنیان، ئەمەش لە پێناو رِازیکردنیان بەو مەبەستانەی، کەسی خوتبەدەر هەڵیاندەگرێت، ئەرستۆ دەڵێت: بریتییە لە دۆزینەوەی ئەو رِێگەچارانەی لە تواناداین بۆ رِازیکردنی بەرامبەر لە هەر چ بابەتێکدا بێت.

ئەمە وەکو هونەرو سنعەتێك لە دایکبووی دورگەی (صەقەلیە)یە لە سەدەی پێنجی پێش زایین، کە ئەو کاتە، ئەو دورگەیە بەشێکی ئەو وڵاتە بووە، کە بە (وڵاتی یۆنانی گەورە) ناوبراوە.. وەکو دەڵێن: ئەرِستۆ لە کتێبێکی ون بووی





خۆیدا بەم شێوەیە لە بارەی سەرهەڵدانی خوتبە دواوە: دوای دەرکردنی داگیرکەران لە ساڵی 467ی پێش زایین، زۆرێکی ئەو هاووڵاتیانەی کە لە سەردەمی داگیرکەران لە وڵاتی خۆیان دوورخرابوونەوەو، دوای دەرکردنی داگیرکەران گەرِابوونەوە، چەند داواکارییەکی مەدەنییان بەرزکردبووەوە، بۆ ئەوەی ئەو ماڵ و موڵکانەیان پێبدەنەوە، کە داگیرکەران بە زۆرو ستەم لێیان زەوت کردبوون ـ کە ئەمە کاری داگیرکەرانە لە هەموو زەمان و مەکانێك ـ بۆ سەرکەوتنیشیان لە وەدی هاتنی ئەو داوایانەیان، پێویستییان بەو کەسانە بوو، کە لەوان ئاقڵترو قسەزانتر بوون و، باشتر دەیانتوانی برِوا بە بەرامبەر بکەن، بۆ ئەوەی ئەوان داواکارییەکانیان بۆ بەرزبکەنەوە، بۆیە بۆ ئەم کارە چەند کەسێکیان رِاسپارد، لەوانە گۆرگس و تسیاس، کە هەردووکیان خەڵکی شاری سەرقوسەی صەقەڵیە بوون، ئەوانە هاتن ئەو یاساو بنەمایانەیان دانا، کە بە پەیرِەوی لێکردنیان، مرۆڤ دەبێتە خوتبەدەری باش.. لێرەوەیە دەڵێن: ئەم دوو کەسانە دامەزرێنەرانی هونەری خوتبەن.

### 9ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی:

بریتییە لە کاری پشکنین و لێکدانەوەی دەقە ئەدەبییە داهێنراوەکان، کە ئەمە بە رِێبازی لێکۆڵینەوەو رِەخنەیی جیا جیا دەکرێت، بوارەکانی زۆرن و، بە هەموویانەوە خزمەت بە کارە ئەدەبیە داهێنراوەکان دەکەن و، بەرەو پێشیان دەبەن.

## هەندێ هونەری ڕەوانبێژی

### یەکەم: هونەری ڕەگەزدۆزی

لە عەرەبیدا (الجناس)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە لە دەربڕیندا بە شێوەیەکی تەواو، یانیش بە کەمتر لەوە، لێکچوونێك لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام لە واتادا هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆیان هەبێت.. ئەوەش دوو جۆری سەرەکیی هەیە: (تەواو و ناتەواو).

**یەك: ڕەگەزدۆزی تەواو (الجناس التام)**

ئەو ڕەگەزدۆزییەیە، کە دوو وشەکانی لە ڕووالەتدا تەواو وەکو یەکبن، واتە دوو وشەکان لە ڕووی ژمارەی پیتەکانیان، شێوەی پیتەکانیان، جۆری پیتەکانیان، ڕیزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکبن و هیچ جیاوازییەکیان لە نێواندا نەبێت، لە ڕووی واتاشەوە هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆیان هەبێت.. بۆ نموونە:

- ئومێدی سەر لە سەر دەرکەن ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن
قەڵەم هەر سەر قەڵەم مۆم بۆ مقەست هەر بۆ ئەویش چاکن... پیرەمێرد

دوو وشەی (سەر) لە نیوە دێڕی یەکەمدا هاتووە، لە هەموو ڕووێکەوە لە ڕووالەتدا تەواو وەکو یەکن، بەڵام لە ڕووی واتاوە: یەکەمیان بە واتای (سەرکەوتن) و دووەمیان بە مانای (مێشك) هێنراون.

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە بۆ کردنە، گەلێ جار دوو وشەکان یەکیان بە یەکپارچەیی و ئەوی تریان بە دوو پارچەیی دێن، بەڵام لەمەشدا چ زیانێك نییە ئەگەر هەردوو وشەکان بە یەکپارچەیی هاتبن، یان یەکیان یەك پارچەو ئەوی تریان بە دوو پارچەیی هاتبێت، چونکە گرنگ ئەوەیە لە چوار مەرجە سەرەکییەکانی ڕووالەتیاندا بە یەکتری یەکسانبن، بۆیە هەندێکی ڕەوانبێژان ئەوە بە گرنگ نابینن، هەندێکی





تریش بۆ هەریەکەیان ناوێك بەکاردێنن، واتە: ئەگەر دوو وشەکان هەردووکیان یەك پارچە بوون، ناوێکی لێدەنێن و ئەگەر دوو وشەکان یەکیان یەکپارچەو ئەوی تر دوو پارچەبوو ناوێکی تری لێدەنێن.

بەلای ئێمەشەوە ئەوە زۆر گرنگ نییە، چونکە ئالۆزی درووست دەکات، ڕەوانبێژیش زانستە دەبێت بە سادەیی و ڕوونی پێشکەش بکرێت، نەك ئالۆزی زۆری بۆ درووست بکەین.. بۆ نموونە:

- چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەکترین
وەك سەرسەرین، شەوێ سەر ناکەینە سەر سەرین... پیرەمێرد

(سەرسەرین) لە نێوەی دێڕی دووەمدا، کە بەسەریەکەوە هاتووە، واتە: کەسێکی سەرسەری و بەدڕەوشت، لە دواتریشدا هەر لەو نیوەدێڕەدا وشەی (سەر سەرین) هاتووە، کە دوو بەشە، بەشی یەکەمی (سەر) بە واتای ڕووی سەرەوەی شت و بەشی دووەمیشی (سەرین) بە واتای (بالیف) هاتووە، بەڵام لە ڕووالەتدا چ جیاوازییەکیان نییە، بۆیە (ڕەگەزدۆزی تەواو)یان درووست کردووە.

- تاڵ و شیرین پێکەوە نەمدیوە چا بێ چا نەبێ
هەرکەسێکی هەمنشینی چا نەبێ پێت چا نەبێ... حەریق

وشەکانی (چا)ی یەکەم و دووەم لە نیوەدێڕی یەکەمدا وەکو یەکن، بەڵام لە ڕووی واتاوە لێکتری جیاوازن، یەکەمیان بە واتای (چایە) دێت و دووەمیان بە واتای (چاك) دێت.

**دوو: ڕەگەزدۆزی ناتەواو (الجناس الناقص)**

ئەو ڕەگەزدۆزییەیە، کە دوو وشەکانی لە ڕووالەتدا تەواو وەکو یەك نین، واتە دوو وشەکانی لە ڕووی ژمارەی پیتەکانیان، یان شێوەی پیتەکانیان، یان جۆری پیتەکانیان، یان ڕیزبوونی پیتەکانیان تەواو وەکو یەك نین و جیاوازییەکیان لە

نێواندا هەیە، جا دەشێت جیاوازیەکە کەم بێت و دەششێت جیاوازیەکە زۆر بێت، لە ڕووی واتاشەوە دەبێت هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆی هەبێت.. بۆ نمونە:

- بەبیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەك

بە پێخواسی نە کەوشم بوو نە کاڵەك... حاجی قادری کۆیی

وشەکانی (باڵەك) و (کاڵەك) هەردووکیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەکو یەکە، بەڵام لە پیتی یەکەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (موزاریع)ی بەرهەم هێناوە.

**جۆرەکانی ڕەگەزدۆزی ناتەواو**

ڕەگەزدۆزی ناتەواو جۆری زۆری هەیە، هەندێ لە گرنگترینیان، ئەوانەی خوارەوەن:

**1ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی موزاریع**

بریتییە لە بوونی دوو وشەی هاوشێوە، کە بە تەنیا لە یەك پیت لێکجیابن، بەو مەرجەی پیتە لێکجیاکان هەریەکەو دەنگێکی سەربەخۆ و لەیەك جیاواز بن، نەوەك هەردووکیان دوو ئەلۆفۆنی یەك دەنگ بن.. بۆ وێنە:

- گوڵ لە باغدا خۆی دەنوێنێ

بولبول بە ڕوویدا دەخوێنێ... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەکانی: (دەنوێنێ) و (دەخوێنێ) ڕەگەزدۆزی ناتەواو دروست دەکەن، چونکە هەردووکیان ژمارەی پیتەکانیان بە قەد یەکە، ڕیزبوون و شێوەی پیتەکانیشیان وەکو یەکە، بەڵام تەنیا جیاوازییان ئەوەیە، کە پیتی یەکەمیان لە یەك جیایە، لە وشەی یەکەم (ی)ەو لە وشەی دووەم (ل)ە.. ئەم جۆرەی ڕەگەزدۆزی ناتەواویش (موزاریع)ی پێدەگوترێت.

- فەمووبووت ئێوە نامرن ئەمێنن

تا سەر ئازادی گەڵتان ئەسێنن... پیرەمێرد





وشەکانی (ئەمێنن) و (ئەسێنن) هەردووکیان لە شەش پیت پێکهاتوون، بەڵام لە پیتی سێیەمیان لێك جیاوازن، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی موزاریع) دروست دەکەن.

**2ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی ڕەها**

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە لە ژمارەو شێوەو ڕیزبوونی پیتەکانیان دەشێ لێکجیابن، بەڵام هەردووکیان یەك ڕەگیان هەیە.. بۆ نمونە:

فاتیحەی لادێ ماڵ بە قوڕ دەگرێ

مردوو بە ڕێی خۆی زیندووی پێ دەمرێ... موفتی پێنجوێنی

وشەکانی (مردوو) و (دەمرێ) لە زۆربەی ڕووەکاندا لێکدیکە جیاوازن، بەڵام هەردووکیان یەك ڕەگیان هەیە، ئەویش چاوگی (مردن)ە.

**3ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد**

لە عەرەبیدا (الجناس الناقس)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە لە هەندێ پیتیاندا لە هەموو ڕووەکانی ڕیزبوون و شێوەو جۆرەوە وەکو یەکن، بەڵام لەولاوە یەکیان لە ئەوی تر بە پیتێك، یان زیاتر زیادە.. واتە: دوو وشەکان جۆر و شێوەو ڕیزی پیتەکانیان وەکو یەك بێ، بەڵام ژمارەی پیتەکانیان ئەوەندەی یەکتر نەبێ، یەکێکیان پیتێك، یان دوو پیت و سێ پیتی لە ئەوی تر زیاتر بێ.. بۆ نمونە:

- بە نوکتەی جوان و ئەشعاری وردی

ڕەواجی داوە بە نەزمی کوردی... بێکەس.

وشەی (کوردی) بە پیتی یەکەمی لە وشەی (وردی) زۆرترە، دەنا پیتەکانی دیکەیان لە شێوەو جۆرو ڕیزبوونیاندا وەکو یەکن، بەمەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد درووستبووە.

- هزرا نەکە، بیرا نەکە

ئێش و ئازار و کۆڤانا قەت ڕانەکە.. خەلیل محەمەد دهۆکی.

وشەی (ڕانەکە) بە دوو پیتی (ڕ) و (ا) لە (نەکە) زیاترە، بەمەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد درووستبووە.

### 4ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی

بریتییە لە بوونی دوو وشە، زیاتر لە پێتێکیان لە ڕووی شێوەوە لەیەك جیابێ، بەڵام ژمارەی پیتەکانیان یەکسان بێ و لەسەر یەك کێش بن.. بۆ نمونە:

- مەڵێ فەقیرم کوفری نیعمەتە

لەشساغی بۆ تۆ موڵك و سەروەتە

پیاوی تەوەزەل لات و نەگبەتە

قۆڵی لێ هەڵکە بچۆرە کایە

سەری بێ ڕۆزی لەژێر خاکایە... بێکەس.

وشەکانی (سەروەتە) و (نەگبەتە) ئەگەرچی شێوەی زۆرێکی پیتەکانیان لێکجیایە، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری (هاوکێشی)ی درووستکردووە.

- ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە یا ڕەب

ئەو مەحرەمی ئەسرار و قەدیمی منە یا ڕەب

ئەو گەوهەری شەهوار و یەتیمی منە یا ڕەب

کەوتۆتە چ بەحرێکەوە خنکاوە دڵی من... بێخود.

وشەکانی (نەدیمی) و (قەدیمی) و (یەتیمی) ئەگەرچی شێوەی زۆرێکی پیتەکانیان لێکجیایە، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری (هاوکێشی)ی درووستکردووە.





### 5ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی

بریتییە لەو ڕەگەزدۆزییە ناتەواوەی، کە دوو وشەکانی ڕەگەزدۆزیەکە درووست دەکەن، هەردووکیان لە ڕووی ژمارەو شێوەو جۆری پیتەکانیانەوە یەکسانن، بەڵام لە ڕووی ڕیزبوونی پیتەکانیان بە تەواوی پێچەوانەی یەکترن، بەمەش دوو وشەکان بێگومان هەریەکەو واتای سەربەخۆش دەبەخشن.. ـ بۆ نمونە: وشەکانی: (حور) و (روح).. وشەکانی: (شەڕ) و (ڕەش).. وشەکانی: (کەو) و (وەك)و بەم شێوەیە.. بۆ نمونە:

- خاترێکی شۆخ و خۆش و بێغەم و جەمعم هەبوو

ئێستە بۆ زوڵفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا... نالی

لەم دێڕەی نالی، وشەکانی (شۆخ) و (خۆش)، هەریەکەیان لە سێ پیت پێکهاتوون و پیتەکان هەر هەمان پیتن، بەڵام لە ڕووی ڕیزبوونیانەوە، وشەی دووەم تەواو بە پێچەوانەی وشەی یەکەم پیتەکانی ڕیز بووە، بۆیە کە وشەی (شۆخ) بە پێچەوانەوە دەخوێنینەوە وشەی (خۆش)مان بۆ بەرجەستە دەبێت و کە وشەی (خۆش) بە پێچەوانەوە دەخوێنینەوە وشەی (شۆخ)مان بۆ بەرجەستە دەبێت، بەمەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی بەرجەستە بووە.

- یەك زێدە شرین زیادە مەحبوب

یەك روح قلوب و حور مەقلوب... ئەحمەدی خانی

وشەکانی (روح) و (حور) دوو وشەنە، هەردووکیان لە ڕووەکانی جۆر و ژمارەی پیتەکانیانەوە وەکو یەکن، بەڵام شێوەی پیتەکانیان تەواو وەکو یەك نییەو پیتی (ح) لە وشەی (روح) شێوەی کۆتایی هەیەو لە وشەی (حور)یش شێوەی سەرەتاو ناوەڕاستی هەیە، ڕیزبوونی پیتەکانیشیان تەواو پێچەوانەی یەکە، واتە هەردوو وشەکە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، یان لە کۆتایی بۆ سەرەتا بیانخوێنینەوە، جارێك

بە (حور) و جارێك بە (حور) دەخوێنرێنەوە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی) درووست بووە.

- ڕەنگە سیمات وەکو هی کەژ
بە ئێوارانی زستانان
تەمێکی قورس دایگرتبێ
ئەو چاوانەت کە دوو کانی روونی نوور بوون
وەکو ئاسکێ کەوا بێچووی ڕاونرابێ
چەند جار جەرگی سووتێنرابێ
لێلاییان داهاتبێ... ئەنوەر قادر محەمەد.

وشەکانی (روون) و (نوور) هەردووکیان ژمارەی پیتەکانیان چوار پیتە، بەڵام ڕیزبوونیان بە پێچەوانەی یەکە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (پێچەوانەیی) درووست دەکەن.

### 6ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی

جۆرێکی ڕەگەزدۆزی ناتەواوە، بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە دووەمیان کەرتی یەکەمیانە، واتە: وشەی دووەم لە ڕووی ژمارەی پیتەکانەوە لە وشەی یەکەم کەمترە، کە ئەوەش وابێت، کەوابێ واتای هەردوو وشەکەش لە یەکتری جیادەبنەوەو هەریەکەیان واتایەکی سەربەخۆی دەبێت، دیارە لێرەدا بە لای هەندێ لە ڕەوانبێژانی عەرەب و کوردیش مەرج ئەوەیە وشەی کەرتکراو لە پێشەوەو ئەو کەرتە وشەی لێیشی کراوەتەوە ڕاستەوخۆ بەدوای خۆیدا بێتەوە، بێ ئەوەی هیچ وشەو دەستەواژەیەك نێوانییان بکات. وەکو بۆ نمونە: (شارستان شار جێناهێڵێ)، (باغەوان باغەکەی فرۆشت)، (دەنگخۆشەکە دەنگی نووسا)، لە هەموو ئەو نمونانەی پێشوو دەبینین، هەمیشە کەرتە وشەی دووەم بە ڕاستەوخۆیی لە پاش کەرتی





یەکەمی هاتووەو واتاشیان جیاو سەربەخۆیە، ئەوەتا لە نمونەی یەکەمدا: وشەی (شارستان) کە بکەرەو گوزارشت لەو کەسە دەکات، کە خەڵکی شارە، یان خاوەن بەهاو نەریتە ژیاری و شارستانییە بەرزەکانە، وشەی (شار)ی لێ کراوەتەوە، کە واتایەکی دیکەی هەیەو بریتییە لەو باژێڕە گەورەی دامەزراوەی جۆراوجۆر و دوکان و کۆشك و سەراو فەرمانگە جۆراوجۆرە خزمەتگوزارییەکان و شتانی دیکەی تیایەو بەوە لە گوند جیادەکرێتەوە.

لە نمونەی دووەمیش وشەی (باغەوان) ئاوەڵناوی بکەرە وەکو ناوو بکەر هاتووە، لە دوای خۆی وشەیەکی دیکەی لێ کراوەتەوە، کە ئەویش وشەی (باغ)ە، ناوی ئەو شوێنەیە، کە داری میوەجاتە جۆراوجۆرەکان لەخۆ دەگرێت. لە نمونەی سێیەمیش، وشەی (دەنگخۆشەکە) وەکو ناوێکی لێکدراوی ناسراوو بکەری ڕستەکە هاتووە، وشەی (دەنگ)ی لێکراوەتەوە، کە ئەو هێما زمانیانەیە، هەر مرۆێك، یان مەخلوقێکی تر دەریدەبڕێت.

لە ئەدەبیاتی کوردی و لە قسەی ئاسایی خەڵکیش، گەلێ جار ئەو هونەرە قسەو دەربڕینەکان جوان و سەرنجڕاکێش و کاریگەر دەکات، ئاوازێکی خۆشیان بۆ درووست دەکات، لە خوارەوە چەند نمونەیەك لەو بارەیە دەخەینە بەرچاو:

- گوڵی باغی ئیرەمی بۆتانم
شەبچراغی شەبی کوردستانم... مەلای جزیری

وشەی (شەبچراغ) کەرتکراوەو وشەی (شەب)ی ڕاستەوخۆ لە دوا هێنراوەتەوە، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی درووستکردووە.

- شەوچرای شەوی کوردستانم ڕۆ
هیوای دواڕۆژی نیشتمانم ڕۆ... دڵزار

وشـەی (شەوچـرا) کـەرتکراوەو وشـەی (شـەو)ی ڕاسـتەوخۆ لـە دوا هێنراوەتـەوە، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروستکردووە.

- ئەمێستاش تاقەتم تاقەو پەرێشان

خرووسم نەخرەسەو حاڵم موفەششەق... شێخ ڕەزای تاڵەبانی.

وشـەی (تاقـەت) کـەرتکراوەو وشـەی (تـاق)ی ڕاسـتەوخۆ لـە دوا هێنراوەتـەوە، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروستکردووە.

**دووەم: هونەری دژیەك**

یەکێکە لە هونەرەکانی جوانکاری واتـایی، لای عـەرەبکان بـە زاراوەکـانی (الگبـاق والمگابقە، والتگبیـق والتـچاد والتکـافوو) ناودەبرێـت، بریتییـە لـە کۆکردنـەوەی دوو وشە، کە ئەو وشـانە لـە ڕووی واتـاوە دژ و پێـچەوانەی یـەك بـن، بـۆ نمونـە: ڕەش و سپی، پاك و پیس، جوان و ناشرین، گەورەو گچکە، پاك و ناپاك...هتد. بۆ نمونە:

- هەر پایەداران ناویان زیندووە

پیاوی بێ کەڵك پەست و مردووە... بێکەس

(زیندوو) و (مردوو) دوو وشەنە دژو پێچەوانەی یەکترین.

گرنگی دژیەك لەوەدایە: لەلایەك جوانییەك بە دەربڕین دەبەخشێـت، لەولاوەش لـە واتای دەق فراوانتر دەکات، کاتێك کە دەڵێیـت (دەر و ژوور)، (شـەو و ڕۆژ)، (پـاك و پیس) گەڕاوم، یان بینیومە، یان هەرشتێکی تر، واتە هیچت نەهێـشتۆتەوە لـە ڕووی ئەو فرمانەی بەکارت هێ‌اوە تاقیت نەکردبێتـەوەو سـوودت لـێ وەرنـەگرتبێت، هـەر ئەمە وا دەکات مەبەستەکانی قسەکەر ڕوونتریش بێت، لەوەی تەنیا یـەك لایـەنی دوو وشە دژیەکەکە بەکاربهێنێت، لەبەر هەموو ئەوانە لە کۆنەوە ئەدەب گرنگی زۆری بەو هونەرە داوەو دەکرێ بڵێین: ئەدیب نییە لە دەربڕینەکانی دژیەك بەکارنەهێنێ.





**جۆرەکانی دژیەك**

لەسەر زیاتر لە بنەمایەك دەشێت جۆرەکانی (دژیەك) دەستنیشان بکرێت، لەوانـە: جۆرەکانی دژیەك بە پێی ڕیشەی وشەیی هەردوو وشە بەیەك دژەکان، واتە: بـە پێـی پێکهاتـەی وشـەیی وشـە دژیەکـەکان دژیـەك دوو جـۆری سـەرەکی هەیـە، ئـەوانیش بریتینە لـە: دژیـەکی فەرهـەنگی (**طبـاق الأیجـاب**) و دژیـەکی نافەرهـەنگی (**طبـاق السلب**).

**یەك: دژیەکی فەرهەنگی**

ئەمە لە عەرەبیدا (**طباق الأیجاب**)ی پێدەگوترێت.. بریتییـە لـە بـوونی ئـەو دوو وشە بەیەك دژو پێچەوانانەی، کە لە فەرهـەنگی زمانـدا هەریەکـەیان ڕیـشەو بنجێکـی ڕەسەن و سەربەخۆی هەیە، بۆ نمونە وەکو: (گەورە) و (بچووك).. دەبینین هەریەکە لەم دوو وشانە لە فەرهەنگدا لە ڕیشەیەکی سـەربەخۆ و خـاوەن کەسـایەتی تایبـەتی خۆیانـەوە سەرچـاوەیان گرتـووە، بۆیـە بـەمجۆرە دژیەکـە دەگوترێـت: (دژیـەکی فەرهەنگی).

شـیعری کـوردی، چ کـۆنی و چ نـوێی و تەنانـەت فۆلکلـۆر و ئەدەبـە میللیەکەشـی پڕیەتی لەو جۆرە دژیەکە.. لە خوارەوە کۆمەڵێك نمونە دەخەینە بەرچاو:

- دانیشم ئاو دەمبا

هەستمەوە گورگ دەمخوا

وام لێهاتییە نازانم چ بکەم؟!... فۆلکلۆر

(دانیشم) و (هەستمەوە) دوو وشـەی خـاوەن دوو ڕەگـی تایبـەت و سـەربەخۆن لـە فەرهەنگدا، هەردوو ڕستەی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروستکردووە.

- بە ڕوئیەتی ماهی مونیر، شاهی بەشیر و هەم نەزیر

تۆی صاحیبی فەزڵی کەبیر، ڕوویی تۆ شەمسی ئەزهەرە... شێخ ئەحمەدی کۆر

(بەشـیر) و (نـەزیر) دوو وشـەی خـاوەن دوو ڕەگـی تایبـەت و سـەربەخۆن لـە فەرهەنگدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان درووستکردووە.

- چای عادەتیمان بوو بە شەش و حەوت

کەمخۆر لە زۆرخۆر زیاتر ئەیویست بەش... گۆران

(کەمخۆر) و (زۆرخۆر) دوو ئاوەڵناوی بکەر لێکدراون، دژ و پێچەوانەی یـەکن، هـەر یەکەشیان ڕەگی سەربەخۆیان هەیە، بەوە (دژیەکی فەرهەنگی) درووست بووە.

- جارانی زوو کە دەهاتی

دڕکیش لە لام دەبوو بە گوڵ... عەبدولڕەحمان بێلاف

(دڕك) و (گوڵ) دوو وشەی خاوەن دوو ڕەگی تایبەت و سەربەخۆن لە فەرهەنگدا، هەردوو ناوی بەرجەستەو سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان درووستکردووە.

- چەتە ترسنۆکترین کەسە لە نرکەی خوێنی کەفکردوو

جامی پێشەوەو پاشەوەی ئۆتۆمبێلیان

بە خوێن و قوڕ سواغ دا... سەباح ڕەنجدەر

(پێشەوە) و (پاشەوە) دوو ئاوەڵفرمـانی شـوێنین، دوو وشـەی خـاوەن دوو ڕەگـی تایبەت و سەربەخۆن لە فەرهەنگدا، دژیەکی فەرهەنگییان درووستکردووە.

**دوو: دژیەکی نافەرهەنگی**

ئەمە لە عەرەبیدا (**طباق السلب**)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بوونی ئەو دوو وشە بەیەك دژو پێچەوانانەی، کە لە فەرهەنگی زماندا هەریەکەیان ڕیشەو بنجێکی ڕەسەن و سەربەخۆی نییە، بەڵکو هەردووکیان لە بنجدا هەر یەك ڕیشەو ڕەگیان هەیە، بـەڵام وشـەی دووەم لەسـەر بنـەمای دژایـەتی و پێـچەوانەیی بـۆ وشـەی یەکـەم درووسـت دەبێت، بە واتـا: وشـەی دووەم هەمیـشە دەبێتـە نـەرێی وشـەی یەکـەم.. بـۆ نمونـە وەکـو: (هـات) و (نـەهات).. دەبیـنین هەریەکـە لـەم دوو وشـانە لـە فەرهەنگدا لـە





ڕیـشەیەکی سـەربەخۆ و خـاوەن کەسـایەتی تایبـەتی خۆیانـەوە سەرچـاوەیان نەگرتووە، بەڵکو وشەی دووەم، کە (نەهات)ە، نەرێی وشـەی (هـات)ەو هـەر لەسـەر بنەمای ئـەو درووسـتبووە، بـەڵام بـە چـەمکی پێـچەوانەیی، بۆیـە بـەمجۆرە دژیەکـە دەگوترێت: (دژیەکی نافەرهەنگی).

جوانی دژیەکی نافەرهەنگی لەوەدایە، کـە لـە ناوەڕاسـتی ئەگـەر و بـارە گـشتی و تایبەتیەکاندا بارێکی ناوەند هەڵدەبژێرێ و لەوێوە مەبەسـت پێـشکەش دەکـات، بـۆ نمونـە لـە قـسەی سـەر زاریـدا زۆرجـار دەگوترێـت: (پیاوەکـە ئیـسرحاتەکی کـرد و نەکرد...)، (ژنەکە مانگاکـەی دۆشـی و نەدۆشـی...)، (منداڵەکـە نانەکـەی خـوارد و نەخوارد...). هەموو ئەمانەش بارێکی ورد و ناسـکی جـوان لـە دەربڕینـدا پێـشکەش دەکەن.

شـیعرو ئـەدەبی کـوردی، چ کـۆنی و چ نـوێی و تەنانـەت فۆلکلـۆر و میللیەکەشـی پڕیەتی لەو جۆرە دژیەکە.. لە خوارەوە کۆمەڵێك نمونە دەخەینە بەرچاو:

- یەکێ هەبوو

یەکێ نەبوو

جگە لە خوا هیچ کەس نەبوو

هیچ هەر نەبوو... هەژاری موکریانی

(هـەبوو) و (نـەبوو) دوو (فرمـانی ناتـەواوی دەمـی ڕابـردوو)ن، دژو پێـچەوانەی یەکترین، دووەم نەرێی یەکەمیانە، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی) بەرهەم هاتووە.

- خۆ دەزانم گورگانە شەوێکی تووشە

لە دووڕیانی هات و نەهات... عەبدولڕەحمان بێلاف

(هات) و (نەهات) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن، دووەم نەرێی یەکەمیانە، بـەوە (دژیەکی نافەرهەنگی)یان درووستکردووە.

- ژین بڕانەوەی بۆ نییە

باسی من من و تۆ نییە

تۆش و زەویش و بەهاریش

بە گیان، بێ گیان، بەرو داریش

ئەستێرە، ئاسمان، مانگ و خۆر

دەبن، دەچن، بە هەل، بە نۆر... هەژاری موکریانی

(بە گیان) و (بێ گیان) دوو دەستەواژەن، یەك ڕەگیان هەیە، کەوا (گیان)ە، یەکەمیان بە پێشگری (ئە)، کە هێمای (ئەرێ)یەو دووەمیان بە پێشگری (بێ)، کە هێمای (نەرێ)یە، کراونەتە دژو پێچەوانەی یەکتری، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی)یان بەرهەم هێناوە.

- تۆ مرنی و تۆ ئەو ترسی

دێ من کوژی و من ناکوژی

من ناکوژی... سعاد سلێڤانەیی

(دێ من کوژی) فرمانی ڕانەبردووی (ئەرێ)یە، (من ناکوژی) فرمانی ڕانەبردووی (نەرێ)یە، واتە: دووەم دژو پێچەوانەی یەکەمە، وەنەبێ هەردووکیشیان دوو ڕەگی سەربەخۆیان هەبێت، بە پێچەوانەوە هەریەکەو یەك ڕەگیان هەیە، ئەوەندە هەیە، وەکو گوتمان: دووەم (نەرێ)ی یەکەمیانە، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی) بەرهەم هاتووە.

- لە دوورەوە

لە نێو دارستانی تەما

دەیخوێنمەوەو نایخوێنمەوە... ئازاد دلزار





(دەیخوێنمەوە) و (نایخوێنمەوە) دوو ڕستەی دژ و پێچەوانەی یەکن، دووەم نەرێی یەکەمیانە، (دژیەکی نافەرهەنگی)یان دروستکردووە.

## سێیەم: هونەری جوانی بایس

لە عەرەبیدا (حسن التعليل)ی پێدەگوترێت.. بریتیە لەوەی ئەدیب بە ئاشکرا، یان بە پۆشراوی هۆی درووست و زانراوی کارێك لە کارەکان، یان دیاردەییێك لە دیاردەکان، پشت گوێ بخات و بێت هۆیەکی ئەدەبی جوان بۆ ئەو کارو دیاردەیە بێنێتەوە، کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی مەبەستیەتی.. واتە ئەو هۆیەی شاعیر بۆ دۆخەکانی دێنێتەوە زادەی خەیاڵی شاعیرانەی خۆیەتی، نەك هەڵقوڵاوی واقیع و ڕاستەقینە بێ.

بە واتایەکی تر: جوانی بایس لێکدانەوەی تایبەت و شاعیریانەی شاعیرە بۆ ئەو بار و دیاردانەی لە سروشت، یان لە دەوروبەری خۆی ڕوودەدەن، بەڵام بێ ئەوەی باس لە هۆیە زانستی و درووستەکەیان بکات، کە لەبەرچی وەهان، چونکە هێنانەوەی هۆی درووست بۆ دیاردەکان ئیشی زاناکانە، نەك ئیشی شاعیر.

سەرچاوەی بەرهەمهێنانی جوانی بایس سۆز و خەیاڵە، مەبەست لێی درووستکردنی کاریگەرییە بەسەر ویژدان و خۆشی خستنە دڵی بیسەرە.. لە ئەدەبی کوردیدا نمونەی لبۆ نمونە:ەو جۆرەمان زۆرە، هەندێ لەو نمونانە:

- بەفریش لە تاو شەرمی هەتاو

ئەتوایەوە ئەبوو بە ئاو... شاڕباژێڕی

بەفر ئەتوێتەوە، ئەمە شتێکی ئاساییە، هۆیەکەی دەرکەوتنی تیشکی بەهێزی خۆرە، شاعیر پەنجە ناخاتە سەر ئەو هۆیە ڕاستەقینە درووستەو ناڵێت بەم هۆیەوە ئیتر ئەو بەفرەی کەوتبوو ئەتوایەوە، بەڵکو بەفر وەکو مرۆڤێکی بە حەیاو شەرم دەچووێنێت، دەڵێت لە شەرمی خۆر ئەتوایەوە! ئەوەش جوانی بایسە، چونکە

شەرم و حەیاکردن تایبەتە بە مرۆڤی ئاقڵ و ڕوو لە بەفر و هیچ شتێکی دیکەی بێ ئەقڵ ناکات.

ـ گوڵە بەڕۆژە عاشقی تەواوە

ئەسوڕێتەوە ڕوو لە هەتاوە... پیرەمێرد

شاعیر دەڵێت: گوڵەبەڕۆژە بۆیە هەمیشە ڕووی لە هەتاوەو لەگەڵ ئەو دەسوڕێتەوە، چونکە عاشقیەتی و عاشقی تەواویش کاری وەها دەکات، بەڵام ئەوەش ڕاستەقینە نییە، چونکە گوڵەبەڕۆژە لەبەر ئەو هۆیە نییە، کە ڕووەو خۆر دەسووڕێتەوە، بەڵکو سووڕی ژیانی خۆی وەهایەو خودا بەو شێوەیەی ژیان بۆ داناوە، ئەوەش (جوانی بایس)ە.

ـ پەڵکە زێڕینەی پاش بارانی زۆر

چەماوەتەوە بەرانبەر بە خۆر... گۆران

وێنەی پەڵکە زێڕینە کە لە دوای بارانی بەهاران دروست دەبێت، شێوەیەکی چەماوەیی هەیە، چونکە لە بەرزییەوە بەرەو خوار دەکەوێتە بەرچاو، ئەوەش بە چ مەبەستێکەوە نییە، بەڵام شاعیر وای پیشان دەدات، ئەوە بۆ ڕێزگرتن لە خۆر چەماوەتەوە، کە لە ڕاستیدا پەلکەزێڕینە لەسەر بنەمای ڕێزگرتن و ڕێزنەگرتن مامەڵە ناکات، کەوابێت ئەوەی شاعیر دەیڵێت، هۆی شاعیرانەیە، نەك هۆی دروست، کە پەلکەزێڕینە بەوشێوەیە، ئەوەش (جوانی بایس)ە.

ـ دڵسۆزی وام نەدی بوو، کە بۆم بگری وەك خەشیم

فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بە ئاونگی تێگەییم... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا شاعیر درێژە بە باسی ئەستێرەکان دەدات، کە لە دێڕەکەی پێشووش باسی کردبوون، دەڵێت: هێندە بەزەییان بە من هاتۆتەوە، شەو تا بەیان بە غەشیمی بۆم دەگریان، ئەوەتا ئەو دڵۆپە ئاوانەی بە (ئاونگ)یان تێگەییم، ئەوە





فرمێسکی ئەوانە نەك ئاونگ، ئەوەش دیارە لێکدانەوەی شاعیرانەیە، ئەگینا ڕاستەقینە نییە، ئاونگ لە فرمێسکی ئەستێرەکان دروست نابێت، چونکە ئەستێرەکان گریانیان نییەو فرمێسکیان لێ بەرنابێتەوە، بەڵکو دروستبوونی ئاونگ مەسەلەیەکی دیکەیە، پەیوەندی بە شێ و هەواوە هەیە، بۆیە لە هەندێ وەرزدا بەیانیان ڕووەك ئەو ئاونگانەیان لەسەر گەڵاکان دروست دەبێت.

ـ مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو

زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو... گۆران

لە شەودا مانگ دەردەکەوێت و دواتر لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەیانی و خۆرهەڵاتن، وردە وردە شەوق و زەوقەکەی شەوی نامێنێ، کز و لاواز و زەرد و بێ شەوق دەبێ، تا لە ڕۆژدا ون دەبێت، هۆی ئەو لاوازی و کزبوون و ونبوونەشی دەرکەوتنی خۆرە، بەڵام شاعیر دەڵێت: هۆی ئەمە بە هۆی ترسی مانگە، لە قاسپە قاسپی کەوی بەیانی، کە دیارە لەوکاتەی خۆرهەڵدێ، لەلایێك (کەو)یش وەکو هەر باڵدار و گیاندارێکی تر لە خەو ڕادەبێت و دەکەوتە جموجۆڵ، بۆ ئەوەش دەقاسپێنێ و ئەندامەکانی دەستەکەی خۆی وشیاردەکاتەوە، کە هەڵسن کاتی کار و کۆششە، لەولاشەوە لەوکاتەدا چونکە خۆر بە تاوتر و بە شەوقترە، بۆیە مانگەکە تینی تیانامێنێ و کز دەبێت، هۆی ڕاستەقینە ئەوەیە، چونکە مانگ پەیوەندی بە کەوەوە نییەو لە کەو ناترسێت، دواتر مرۆڤ نییە لە ترسان ڕەنگی زەرد بێت، بەڵام ئەو هۆیەی شاعیر بۆ زەردبوونی مانگ دەیهێنێتەوە، خەیاڵی شاعیریانە دروستی دەکات، ئەوەش (جوانی بایس)ە.

ـ تریفەی مانگە شەو لەسەر کەل و گرد

باسی یەکبوونی گەلی کوردییەکرد... خورشیدە بابان

تریفەی مانگ چونکە بە دەوری مانگەکە درووست دەبێت شێوەکەی بازنەییەکی خڕ و یەکپارچەییە، شاعیر دەڵێت: ئەوە بۆیە وایە، چونکە باسی یەکبوونی کورد دەکات و دەیەوێت تێمان بگەیەنێت، کە کورد دەبێت یەکپارچە بێت، ئەوەش خەیاڵێ شاعیرانەیە، دەنا تریفەی مانگەشەو هەقی بەسەر یەکبوون و یەکنەبوونی چ گەل و نەتەوەیەکەوە نییە، بەم شێوەیە (جوانی بایس)ێکی جوان درووست بووە.

- ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بە شەو

وەك من بە داخەوەن نە سرەوتیان هەیە نە خەو... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا شاعیر باس لە (ئەستێرە بەرزەکان) دەکات، کە بە شەو دەدرەوشێنەوەو جوانن، وای لێکدەداتەوە، کە ئەوانیش چ سرەوت و چ خەویشیان نییەو وەکو شاعیر غەمبارن، بۆیە ناخەون و لە درەوشانەوەی خۆیان بۆ ساتێکیش ناکەون و هەر تیشك بڵاودەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەستێرەکان وەکو ئادەمیزاد نینە پێویستییان بە خەو و سرەوتن بێت، بەڵکو هەر سروشتی خۆیان وەهایە، تا خۆر پەنهان بێت لە زەوی، ئەوان لە دڵی ئاسماندا بەو تیشکەی لە خۆریان وەرگرتووە جوان بدرەوشێنەوە، کە خۆریش دەرکەوت، ئەوان وردە وردە تیشکەکانیان کزبێتەوە تا بگەنە ئاستی نەمان.

**چوارەم: هونەری جیاکردنەوە**

بریتییە لە خستنەڕووی شتێك بە پەسنێکی گشتییەوە، ئینجا دواتر لە پەسنێکی تایبەت، شتێکی دیکە بەسەر شتەکەی پێشوو زەقبکرێتەوە، مەبەستیش لەمە جیاکردنەوەی دۆسییەکانە.. بۆ وێنە:

- عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم، ئەفزەلن، ئەمما

سەلاحەدین کە دونیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو... شێخ ڕەزای تالەبانی





لەم دێڕەدا شاعیر سەرەتا هاتووە، بە شێوەیێکی گشتی پەسنی میللەتی عەرەبی داوە، ئەوەی دەرخستووە، کە: ئێوەی عەرەب بە هۆی بوونی پێغەمبەری گەورە (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە ئێوە، لە گەلانی دیکە چاکەدارترن و چاکەتان بەسەر هەمووانەوە هەیە، من لاملێیی لەوە ناکەم، بەڵام دوای ئەوە شاعیر هاتووە بە شێوەیێکی تایبەت سەلاحەدینی گەورە سەرکردەی کورد و جیهانی ئیسلامیی جیاکردۆتەوە، ئینجا دووبارە ڕووی دەمی کردۆتەوە عەرەبەکان و گوتوویەتی: بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوەش بن، کە پێشەواییێکی مەزنی وەکو سەلاحەدینی ئەیوبی، کە لەسەر دەستیدا ئەو هەموو سەرکەوتن و سەروەرییەی بۆ جیهانی ئیسلامی و سەرجەم موسلمانانی جیهان تۆمارکرا، کوڕە کوردێکی قارەمانی کوردستان بوو، بەمەش شاعیر دۆسیەی چاکەو سەروەرییەکانی هەردوو میللەتی کورد و عەرەبی سەرکەوتووانە لێك جیاکردۆتەوە.

**پێنجەم: هونەری جێگۆڕین**

لە عەرەبیدا (القلب)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی گوتە چ لە سەرەتاوە تا کۆتایی وشەکانی بخوێنرێتەوە، چ لە کۆتایی بۆ سەرەتا وشەکانی بخوێنرێتەوە هەر هەمان شت دەربچێت، بۆ نمونە:

- تەنگانە وا دەبێ کە لەو جێگە تەنگەدا

سائیل نەکیری عاریف و مەعروف مونکەرە... نالی

(نەکیری عارف) کە لە سەرەتای نیوەدێڕی دووەمدا هاتووە، دواتر لە کۆتایی دێڕەکە کراوەتە (مەعروفی مونکەر)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

جوانی جێگۆڕین لەوەدایە، کە جۆرێکە لە گەمەکرد بە وشە، ئەوەش زۆرجار واتا دەگۆڕێت و هەندێ جاری تریش واتا وەکو خۆی دێڵتەوە، بۆ نمونە (شێت چادەکەی) واتە: دەتوانی شێتان لە نەخۆشییەکەیان ڕزگار بکەیت و چاکیان

بکەیتەوە، بەڵام کە جێگۆڕینی لێ دروستدەکرێت و دەبتە (چادەکەی شێت)، ئەم ڕستەی دووەم واتاکەی جیاوازە، واتە: تۆ هۆیەکی بۆ ئەوەی خەڵك شێت بن. ئەوەش جوانییەکە دەبەخشێت. هەندێ جاری تریش بۆ جەختکردنەوە لەسەر هەمان واتای یەکەم دێت، بەڵام بە شێوەیەکی نوێ، کە خوێنەر لە وەڕسی ڕزگار دەکات.

ـ ئەی بێ نەزیڕ و هەمتا سەتتارو کردگاری

بێ عەیبی عەیب دەپۆشی، کردگار و سەتتاری... حاجی قادری کۆیی

(سەتتار و کردگاری) کە لە کۆتایی نیوەدێڕی یەکەمدا هاتووە، دواتر لە کۆتایی دێڕەکە کراوەتە (کردگار و سەتتاری)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

ـ ئەڵێم ئەوجار ناوت بێنم

ئەوجار ئەڵێم بتناسێنم... هێدی

(ئەڵێم ئەوجار) کە لە سەرەتای نیوەدێڕی یەکەمدا هاتووە، دواتر لە کۆتایی لە نیوەدێڕی دووەمدا کراوەتە (ئەوجار ئەڵێم)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

ـ عەشق و جوانی لەسەر من و تۆدا کەوتە ڕوو

من بەختی تۆم خەوم نییە، تۆش بەختی من بنوو... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا لە نیوەدێڕی دووەم سەرەتا (من بەختی تۆم) هاتووە، لە پاشان شاعیر جێگۆڕکێی بە وشەکانی ئەو ڕستەیەی کردووەو گوتوویەتی: (تۆ بە ختی من)ی، کە هەردوو ڕستە ئەگەر یەکەمیان لە سەرەتاوە بخوێنیەوەو دووەمیان لە کۆتاییەوە هەر یەك شت دەردەچن، یانیش ئەگەر دووەم لە سەرەتاو یەکەم لە کۆتایی بخوێنیەوە دیسانەوە هەر یەك شت دەردەچن، بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروستکردووە.





ـ تا کەنگێ مێرووڵەی لەشت

باری قوڕسی سەرت لەسەر شان دابنێ و

لە ئاوارەیی بۆ زیندان

لە زیندان بۆ ئاوارەیی

بتلێتەوە... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا لە دێڕی سێیەم شاعیر (لە ئاوارەیی بۆ زیندان)ی نووسیوە، لە دێڕەکەی دواتر ڕستەکەی هەڵگێڕاوەتەوە، واتە جێگۆڕکێی بە وشەکانی کردووەو کردوویەتییە (لە زیندان بۆ ئاوارەیی). دیارە لێرەشدا ئەگەر هەردوو ڕستە وەربگرین، بێین یەکەمیان لە سەرەتاوە بخوێنیەوەو دووەمیان لە کۆتاییەوە هەر یەك شت دەردەچن، یانیش ئەگەر دووەم لە سەرەتاو یەکەم لە کۆتایی بخوێنیەوە دیسانەوە هەر یەك شت دەردەچن، بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروستکردووە.

ـ هونەرمەندیت لەوەیدا نازەنینم

کە هەم شێت چادەکەی هەم چادەکەی شێت... حەسەنی دانیشڤەر

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی دووەم شاعیر دەڵێت: (شێت چادەکەی)، لە دوای ئەو ڕستەیەی هەڵگێڕاوەتەوە، جێگۆڕکێی بە وشەکانی کردووەو کردوویەتییە (چادەکەی شێت). بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروستکردووە.

ـ لەو ڕۆژانەوە دێم کە تیایدا

خاك من بووم و

من خاك... عومەر سەیدە

لەم کۆپلەیەدا لە دێڕی دووەم شاعیر (خاك من)ی نووسیوە، لە دێڕەکەی دواتر ئەم دەستەواژەیەی هەڵگێڕاوەتەوە، جێگۆڕکێی بە وشەکانی کردووەو کردوویەتییە (من خاك). بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروستکردووە.

- بگرین هەموو

وەکو چاوی بن تووی مەلیك

لە بناری ئەم دیو گۆیژە

هەموو بگرین... ئەژی گۆران

(بگرین هەموو) کە لە سەرەتای ئەم کۆپلە هاتووە، دواتر لە کۆتایی کۆپلەکە کراوەتە (هەموو بگرین)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

**شەشەم: ڕێبازی گوتەیی**

لە عەرەبیدا (**المذهب الکلامي**)ی پێدەگوترێت.. لەلای (ئیبنول موعتەز) بە هونەری پێنجەمی (جوانکاری) دانراوە، (ئیبن و ڕەشیق) لە بەشی دووەمی کتێبەکەی خۆیدا (العمدە) دەڵێت: ((ڕێبازێکی گوتەیی فەلسەفییە))، (زەرکەشی)ش دەڵێت: ((بریتییە لە پاساوهێنانەوە بۆ واتای مەبەست، بە پاساوێکی ئەقڵی وەها هیچ لاملێییکردنێك بۆ خۆی نەهێڵێتەوە)).

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕایانەش دەتوانین بڵێین: بریتییە لەوەی شاعیر، یان نووسەر لەسەر شێوازی کەلامییەکاندا بەرگری لەو بیرەی خۆی بکات، کە پێشکەشی دەکات و بەرگریکردنەکەیشی لە بیرەکەی خۆی بە بەڵگەی ئەقڵی وەهابێت، بەرانبەر چ بیانوویێکی بۆ نەمێنێتەوەو یەکسەر بڕوای پێبکات.

لای پیرەمێردی شاعیر نمونەی وەها لە گەلێ لە دێڕەکانی بە دیار دەکەون، بۆ نمونە:

- چاوم هەڵبڕی ئاسمانم دی

گوتم: بێ وەستا نەهاتۆتە دی

ئەگەر کردەوەی بێگانە بووایە

خۆ ئەشیا بێ ستوون ڕانەوەستایە





دیارە هەر چەرخێك پیاو دروستی کا

کاتێکت زانی سوواو تێك شکا... پیرەمێرد

شاعیر لێرەدا باس لەوە دەکات، کە ئەم ئاسمانە بێ خاوەن خەڵقنەبووەو ئەوەی خەڵقیشی کردووە زۆر ئەفرایندەو بەدیهێنەرێکی گەورەو بە توانا بووە، چونکە ڕاگرتنی ئەو ئاسمانە گەورەو فراوانە بەبێ ستوون، ئەمە کارێکی ئەقڵ قەبوڵی ناکات هیچ مرۆڤێك هەبێت لەسەر پشتی ئەو زەوییە پێی بکرێت، تەنانەت ئەو کارانەیش کە ئادەمیزاد دەیانکات، بە زوویی تێکدەچن، بەڵام کە ئەو کارەی خوا هەزارەها ساڵە بەو تەواوییە وەکو خۆی ماوە، ئەوە بەڵگەیەکی ترە لەسەر خالقیەت و تواناداری خوا لەو بارە.. واتە: ئەو کارەی ڕاگرتنی ئاسمانەکان بێ هیچ کۆڵەگەو ستوونێك، کارێکە هەر لە خوای تەنیا دەوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی خاوەنی سیفاتی (قودرەت و کەماڵ)ەو لە هەموو شتێکدا تەواوە.

- ئەبێ بەخشندە مل کەچکا لە ڕاستی مووچەخۆری خۆی

سوراحی سەر فرودێنێ لە بۆ پیاڵە، کە تێ کا بۆی... پیرەمێرد

شاعیر ئەم شیعرەی بۆ (شێخ مەحمود) ناردووە دوای ئەوەی شێخ چەند مانگێك لەسەر شیعرێ:ی تری لێی توڕەبووەو نەیهێشتووە بگاتە لای، (پیرەمێرد)یش ئەوەی بەلاوە قورس بووە، هاتووە بەو شیعرەی دڵی چاککردۆتەوە، بە بەڵگەی ئەقڵی تێی گەیاندووە، کە بۆ ئەو گونجاو نییە لە کەس توڕەبێت، بەڵکو دەبێت خاوەنی لێبووردن بێت لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆی.. بۆیە لەو دێڕەی سەروو نووسیویەتی: کەسی گەورە دەبێت لەگەڵ بچوکی خۆی لێبووردە بێت، چاوپۆشیکەربێت، هەمیشە کۆمەکی بکات، نەك پەڵپی لێبگرێت و حسێب بۆ هەڵەکانی بکات. بەڵگە ئەقڵییەکەیشی ئەوەیە، کە دەڵێت: ئەدی ئەوە نییە

سوراحی بەو گەورەییەی خۆی بۆ بەرداخێکی بچوك مل شۆڕدەکاتەوە تا پێی ببەخشێت و لێیشی بێزار نابێت؟!

ـ لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقەش بۆ سەر پەلی بەردار.. پیرەمێرد

شاعیر بەردەوام دەبێ، لەسەر بەڵگە ئەقڵییەکانی وەکو چۆن کەلامییەکان وەها پاساو بۆ ڕاکانی خۆیان دێننەوەو بە شێخ دەڵێت: لقە شۆڕەکانی درەخت خەڵك پێویستیان بەوە نییە دار و بەردی تێبگرن، هەر خۆیان دەستیان پێی دەگات و بەروبوومەکەی دەخۆن، بەڵام پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزەو لەقەش بۆ سەر ئەو پەلانەیە، کە بەردارن و بەرزن، دەستی خەڵکی ئاسایی پێیان ناگات، ئەدی چییان لێبکات؟! واتە شاعیر دەڵێت: تۆ پەلێکی بەرزی، خۆ پەلێکی نزم و ئاسایی نیت، بەرژەوەندی خەڵکیت لەلایە، ئەی چۆن خەڵك بۆ زامنکردنی ئەو بەرژەوەندییانەیان بەر پلارو شتی دیکەت نادات؟!

ـ دوو گوێ و زوبانێك دراوە بە تۆ
دوو ببیەو یەکێك بڵێ لەسەر خۆ... پیرەمێرد

واتە بۆیە دوو گوێ و یەك زوبانت پێدراوە، بۆ ئەوەی دوو قسە ببیسی و یەك قسە بکەیت، ئەدی نابینی خودا وەهای خەڵقکردووی؟! ئەدی کەوابێت بۆ وەها نەکەیت؟!

ئەم بەڵگانەی هەموو ئەو دێڕانەش، بەڵگەی ئەقڵی شاعیرن، بەرانبەر دەخەنە ئەمری واقیع، ناتوانێت ملکەچییان نەکات.

## سەرچاوەکان

**یەکەم : سەرچاوەکانی کوردۆلۆجی**

1- ئەکرەم قەرەداغی ، بیبلۆگرافیای کورد و کوردستان، سلێمانی ، 1999.

2- فەرهاد پیربال، زێڕی ناو زبڵ، سلێمانی 1999.

3- كلثومة جميل عبدالواحد، كردستان في عهد الساسانيين، اربيل، 2007.

4- کاوە هاوراز، ڕۆژهەڵاتناسی ، هەولێر ، 2003.

5- هەروەها کتێبەکانی ( تاريخ الطبري، كامل في التاريخ، صورة الارض، البداية و النهاية).

**دووە م: سەرچاوەکانی بەشی جوگرافیای کوردستان**

1ـ د.عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای کوردستان، چاپی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، 2005.

2ـ د. نيشتمان بشير، الكورد والسلاجقة، نامەی دکتۆرای پێشکەشکراو بە بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 2001.

3ـ کوردستان و کورد، د. عەبدولڕەحمان قاسملۆ، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، 1973.

**سێیەم : سەرچاوەکانی بەشی زمان**

1- د.ئەورەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی ، سلێمانی 2004.

2- جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا بڵاوی کردۆتەوە،ئەلمانیا،بامبێرگ، 1976.





3- د.بەکر عومەر عەلی و شێرکۆ حەمەئەمین، زار و شێوەزار ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی ، 2007.

4- حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ،2005.

5- زبێر بیلال، مێژووی زمانی کوردی،وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە یووسف ڕەئوف عەلی، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا ، 1984.

6- سەلام ناوخۆش ، فەرهەنگی ئۆکسفۆردی نوێ، چاپی سێیەم، سلێمانی ، 2007.

7- سەلام ناوخۆش ، پێنج دیدار لە بارەی زمانی ستاندەرەوە .

8- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی ، بەرگەکانی (یەکەم و دووەم و سێیەم)، چاپخانەی منارە، هەولێر ، 2009.

9- سەدیق بۆرەکەیی ، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی ، یەکەم، هەولێر ، 2008.

10- شەرەفخانی بدلیسی ، شرفنامە، هەژار کردوویەتی بە کوردی، چاپی یەکەم ، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،1981.

11- د. علي عبدالواحد وافي، علم اللغة، دار نهظة ر لطباعة و النشر، 1967.

12- د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی،چاپی یەکەم، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)،بەغدا، 1971.

13- د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ،بۆ زمان، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە،چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ،2005.

14- فەرهاد پیربال ، ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، دهۆك، 1999.

15– فوئاد حەمە خورشید، زمانی کوردی دابەشبوونی جوگرافیـای دیالێکتـەکانی ، و: حەمە کەریم هەورامی، بەغدا، چاپخانەی (افاق العربیه)، بەغدا،1985.

16– قـەیس کاکـل ، ئاسایـشی نەتـەوەیی و پلانـی زمـان، دەزگـای موکریـانی ، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، 2007.

17– د.کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمـانی کـوردی و زمـانی ئـەدەبی و نووسـینیان، گۆڤاری زانیاری، ژ.2، بەغدا، 1971.

18– کوردۆ ئەحمەد، فێربوونی زمانی فەرەنسی بە ئاسانی ، هەولێر ، 2004.

19– گۆڤاری هاڤیبوون، ژمارە(19–20)،2008.

20– گۆڤاری زمانناسی ، ژمارە (3)، 2009.

21– محەمـەد ئـەمین هـەورامانی، زاری زمـانی کـوردی لـە تـرازووی بەراوورددا،دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ،1981.

22– محەمەد ئەمین هەورامانی،مێژووی رێبازی زمانی کـوردی، لـە بڵاوکراوەکـانی مەڵبەندی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی انکۆی سەلاحەدین، 1990.

23–محەمـەد ئـەمین هەورامانی،سـەرەتاییێک لـە فیلۆلـۆژی زمـانی کـوردی، بەرێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری کوردی،چاپخانەی مەعاریف ،بەغدا ، 1974.

24– محمد معروف فتاح، زمانەوانی ، زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی دار الحکمە، بەغدا ، 1990.

25– نافیع دیبەگەیی ، بنەماکانی رێنووسی کوردی لاتینی ، سلێمانی، 2006.

### سەرچاوە ئینگلیزییەکان

1-Aitchson,j, 1993,Linguistics,London.

2-Crystal,D, 1993 , Language and Languages, London.





3-Fromkin,v,Robert Rodman and Nina hyams;2003,An introduction toLanguage,7th ed.

4-Wardhaugh,R,1990,An introduction to sociliinguistics, Cambridge.

5-Yule,G.2006.The study of Language,3rd ed, Cambridge.

### سەرچاوەکانی هەردوو بەشی (ئەدەب و ڕەوانبێژی) بریتین لە :

یەکەم: کتێب بە زمانی کوردی:

1 ـ ئەرپستۆتلس، هونەری شیعر (پۆیتیکا)، و: حەمید عەزیز، سلێمانی 2005

2 ـ د. شوکرییە ڕەسول، ئـەدەبی کـوردی و هونـەرەکانی ئـەدەب،مطـابع التعلـیم العالي، هەولێر، 1989.

3 ـ عەلائـەدین سـەجادی، مێـژووی پەخـشانی کـوردی، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، 2000.

4 ـ هۆراس، هونەری شیعر، و: حەمید عەزیز، چاپی دووەم هەولێر 2005.

دووەم: کتێب بە زمانی عەرەبی:

5ـ د. احمد مطلوب، البلاغة العربية، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، 1980.

6ـ أرسـطو، الخطابـة ، ت: د. عبـدالرحمن عبـدي، دار الرشـيد للنـشر، بغـداد، 1980.

7ـ الخطيب القزويني، الأيضاح في علوم البلاغة، طبعة ايران، دون سنة الطبع.

8ـ سعدالدين التفتازاني، شرح المختصر، الجزء الثاني، ايران، دون سنة الطبع.

9ـ د. محمد حسن عبدالله، فنون الأدب، دار الكتب الثقافية، الكويت، الطبعة الثانية، 1978.

10ـ محمود البستاني، القواعد البلاغية، ط 1، طبعة ايران، دون سنة الطبع.

